


# کاتیگۆرییەکان

نووسینی : ئەریستۆ
وەرگێڕانی: د. محەممەد کەمال
بابەت: فەلسەفی
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخ: ١٠٠٠ دینار
ژمارەی سپاردن: ١٩٥٧ ی ٢٠٠٩
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی: یەکەم ساڵی ٢٠٠٩
کوردستان- سلێمانی
www.serdam.org
بۆ پەیوەندیکردن بە زنجیرەی کتێبەوە: kteb@serdam.org


سەرچاوە/
Aristotle, "Categories", translated by J. L. Ackrill, in *The Complete Works of Aristotle*, vol. 1, the revised Oxford translation, Jonathan Barnes (ed.), Princeton : Princeton University Press, 1995.

ئەریستۆ

# کاتیگۆرییەکان

وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە
د. محەممەد کەمال

سلێمانی ۲۰۰۹

## پێشەکی

کاتیگۆرییەکان ناوی پەرتووکێکی ئەرستۆیە، کە ئەم بیریارە لە تەمەنی لاوێتیدا، ئەو کاتەی لە ئەکادیمیای ئەفلاتون خوێندکاربووە، نوسیویەتی. هەرچەندە بە قەوارە بچوکە، بەڵام یەکێکە لە شاکارە فەلسەفییەکان و پەیوەندییەکی بنەڕەتیی بە لۆجیک و ئۆنتۆلۆجییەوە هەیە. ئەم کاتیگۆرییانە تەنیا چەمکێکی ڕووت نین و ئەریستۆش لەم نوسراوەیدا لە کێشەیەکی زمانەوانی نادوێت، بەڵکو لەو باوەڕەدایە کاتیگۆرییەکان لایەنەکانی بوون دەردەخەن. هەر یەکێک لە ئەوان ئاماژە بۆ بەشێکی بوون دەکات، کە بە بێ ئەوان ئێمە ناتوانین لە واتای بوون تێبگەین.

(کاتیگۆری) وشەیەکی یۆنانییە، واتای تاوانبارکردنی کەسێک دەبەخشێت؛ کەسێک لەبەردەم ئەوانی دیکەدا تاوانباربکرێت. ئەریستۆش بۆ مەبەستێکی فەلسەفی جیاواز بەکاریهێناوە. لە فەلسەفەدا کاتیگۆری ئەو چەمکە هەمەکییەیە، کە لایەنێکی بوون ئاشکرا دەکات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، لەگەڵ بەکارهێنانی کاتیگۆرییەکدا پەنجە بۆ لایەنێکی بوون درێژدەکەین، تاوانباری ناکەین، بەڵکو ڕاستییەکەی دەردەخەین. بۆ نموونە، کە دەڵێین (گۆچان خوارە) ئاماژە بۆ چۆنیەتی ئەو بوونە دەکەین، کە گۆچانە. لێرەدا گۆچان و خەسڵەتەکەشی کاتیگۆرین.

ئەگەر دروست بێت، ئەریستۆ ئەم پەرتووکەی ئەو کاتە نوسیبێت، کە لای ئەفلاتون خوێندویەتی، ئەوا دەردەکەوێت، کە لە تەمەنی لاوێتییەوە، نەک پاش مردنی ئەفلاتون، جیاوازی نێوان بۆچوونە فەلسەفییەکانی ئەریستۆ و ئەفلاتونی مامۆستای سەریهەڵداوە. هەروەها هاوڕانەبوونی لەگەڵ (پارمەنیدس) لەسەر گۆڕان لێرەوە دەستیپێکردوە. ئەفلاتون لەو باوەڕەدایە چەمکە هەمەکییەکانی، وەکو جوانی و چاکە و مرۆڤ و درەخت و ئەسپ و هتد، بوونێکی سەربەخۆ و بەرز و جیاوازیان هەیە. ئەم چەمکانە فۆرم (ئایدیا)ی هەمەکی و لە ئەستو بەدەرن و لە جیهانی ژوور ئەم جیهانە ئەستوییەی ئێمەوە دانراون. بوونیان لەنێو ئەو جیهانە بەرزەدا پێویستی بە جیهانی ئێمە و بابەتە هەندەکییەکان نیە. ئەم فۆرمانەی ئێمەش، تەنانەت بە بوونی ئێمەشەوە، کە لەم جیهانەدا دەدۆزرێنەوە (کۆپی) یان لێوەرگیراوی ئەو فۆرمە هەمەکییانەی جیهانە بەرزەکەن. ئەوەی لەنێو ئەم جیهانەی ئێمەدا هەیە شتێکی لە ڕاستی بەدەر و ناتەواوە چونکە ڕاستی فۆرمی هەمەکییە لەنێو جیهانی بەرزدا دانراوە. هەروەها هەموو شتێک، لەخوار بوونی ئەو فۆرمانەوە، کە لێوەرگیراوی ئەوانە ناتەواوە. ئێمە شتێکی جوان دەدۆزینەوە، بەڵام هاوکات نابێت لە بیرمان بچێت، کە لەوەش جوانتر و لە هەموو شتە جوانەکانیش جوانترین شت هەیە، کە فۆرمی جوانییە و لە جیهانی بەرزدایە. جوانییەکە بە بێ گۆڕان، بە بێ ئەوەی بۆ کەسێک جوان بێت و لە چاوی کەسێکی دیکەشدا ناشرین. جوانییەکی هەمیشە نەگۆڕ و ڕەهایە.

من لەو باوەڕەدام ناکۆکی ئەریستۆ لەگەڵ ئەم بۆچوونە مێتافیزیکییەی ئەفلاتوندا لەسەر بوونی جوانی ڕەها یان چاکەی ڕەها نیە. ئەگەر

بە وردی بڕوانینە سیستەمی مێتافیزیکی ئەریستۆ دەبینین ئەویش باوەڕی بە بوونێک هەیە نەگۆڕ و هەمیشەیی بێت یان فۆرمێکی ڕووت و کردەکی بێت. ناکۆکییەکە لەسەر بوونی سەربەخۆ و جیاوازی فۆرمە هەمەکییەکانە لە بابەتە هەندەکییەکانەوە. بۆ ئەفلاتون جوانی بە بێ شتێکی جوان و ڕەنگی سور بە بێ بابەتێکی سور هەیە. جوانی و ڕەنگی سور زەمینەی ئۆنتۆلۆجی خۆیان هەیە و ئەوان شتێکی جوان یان بابەتێکی سور دەهێننەکایەوە. ئەفلاتون لە دایەلۆگی کۆمار و فیدۆدا باسی ئەم پەیوەندییە هۆیەکییەی نێوان فۆرمەکان و بابەتە هەندەکییەکان کردوە. بە ئاشکرا بانگەشەی ئەو بیروباوەرەی کردوە، کە بە بێ جوانی یان ڕەنگی سور، شتێکی جوان و بابەتێکی سور نادۆزینەوە. ئەریستۆ بە پێچەوانەوە بۆ ئەم کێشەیە دەچێت. لەو باوەڕەدایە بە بێ شتێکی جوان و بابەتێکی سور جوانی و ڕەنگی سور نین. بۆ ئەوەی جوانی یان ڕەنگی سور ببینن، پێویستە بە دوای شتێکی جوان و بابەتێکی سوردا بگەڕێین. ئێمە لە ئەزموونی ڕۆژانەماندا ئەوەی هەستی پێدەکەین شتی جوان و بابەتی سورە، نەک جوانی و ڕەنگی سور. ئەگەر بمەوێت جوانی یان ڕەنگی سور نیشانی کەسێک بدەم پەنجە بۆ شتێکی جوان یان بابەتێکی سور ڕادەکێشم. ئەمەش ڕەتدانەوەی بۆچوونەکەی ئەفلاتونە، کە چەمکی هەمەکی لە بابەتە هەندەکییەکان جیادەکاتەوە و بوونێکی سەربەخۆی بەرزیان دەداتێ و هاوکات ڕەتدانەوەی بوونی جیهانی بەرزی ئەم فۆرمانە یە. پارمەنیدس ڕاستەقینەی بە (بوون) داناوە و باوەڕی بە (نەبوون)نەکردوە. بۆ ئەم بیریارە بوون هەیە و نەبوون نیە. ئەمەش پارمەنیدسی گەیاندە ئەو ئاکامەی (گۆڕان) ڕەتبداتەوە. گۆڕان لە دوو حاڵەتدا ڕوودەدات، گۆڕانێک لە بوونەوە بۆ نەبوون، هەروەها لە نەبوونەوە بۆ بوون. ئەگەر نەبوون نەبێت

و ئەوەی هەیە بوون بێت، چۆن باسی گۆڕان بکەین چونکە گۆڕان لە بوونەوە بۆ بوون، وەکو گۆڕان لە ڕەنگی سورەوە بۆ سور بێ واتایە. بێگومان ئەم بۆچوونەی پارمەنیدس، کە لە چەند دێڕێکی شیعریدا دەربڕاوە، کاریکردۆتە سەر بیرکردنەوەی ئەفلاتون. لەبەر ئەمەش ئەفلاتون فۆرمە هەمەکییەکانی نێو جیهانی بەرز بە نەگۆڕ دادەنێت. هەر شتێک پڕ و تەواوبێت، لەوە زۆرتر گۆڕان بەخۆوە ناگرێت. گۆڕان بەسەر جوانی ڕەهادا نایەت. ئەوەی دەگۆڕێ شتێکە کەم جوانە و دەیەوێت جوانتر بێت. ئەریستۆ نکۆڵی لە ڕاستەقینەی گۆڕان ناکات. لەو باوەڕەدایە گۆڕان بەسەر سێ کاتیگۆری بووندا دێت. بۆ نموونە گۆڕانکاری لە چۆنیەتی و چەندەکی و هەروەها شوێندا هەیە. ئێمە دەزانین سوکرات فەیلەسوفە، هەمان کات ئەو دەتوانێت واز لە فەلسەفە بهێنێت و ببێت بە دارتاش. ئەمە گۆڕانکارییە لە چۆنیەتی سوکراتدا. هەروەها بە هەمان شێوە چەندەکی سوکرات و بوونی لەنێو شوێندا گۆڕانیان بەسەردا دێت. بەڵام سوکرات خۆی، کە جەوهەرە گۆڕانی تێدا ڕوونادات. سوکرات لەوە کەمتر یان زۆرتر نابێت بە سوکرات. هۆی نەگۆڕانی جەوهەریش لەدواییدا ڕووندەکەمەوە.
دەبینین لەم قۆناغەوە، لە سەردەمی ئەکادیمیاوە (مەبەستم ئەکادیمیای ئەفلاتونە)ئەریستۆ ڕێگەیەکی تایبەت و جیاوازی بیرکردنەوەی فەلسەفی بۆ خۆی دۆزیوەتەوە و لەگەڵ دوو بلیمەتی فەلسەفەی یۆنانییدا (پارمەنیدس و ئەفلاتون) ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێت. لێرەوە سەرەتای سەرهەڵدانی فێرگەی فەلسەفی ئەریستۆ دەردەکەوێت.

ئەریستۆ (دە) کاتیگۆری لەم نوسراوەدا باسکردوە. لە نوسراوەکانی دیکەشدا، وەکو مێتافیزیک (بە تایبەتی لە بەشی (کاپا) دا، ئاماژەی

بۆ کردوون. لە سەرەتای ئەم نوسراوەدا (کاتیگۆرییەکان) باسی ئەو شتانە کراوە، کە هاودەنگ و هاوواتا و هاوسەرچاوەن. ئەو شتانەی ناوێکی هاوبەشیان هەیە و لە پێناسەدا جیاوازن هاودەنگن. بۆ نموونە وشەی (پەڵە) بە دوو شتی جیاواز دەوترێت. پەڵە بارانی تێر دەخڵ و (لەکە) شە بەسەر شتێکەوە. (گۆڤان) گۆڕەپانی یاریکردن و گەواهیشە، (خێو) واتای خاوەن و جنۆکەش دەبەخشێت. ئەم شتانە بە ناو هاوبەشن، بەڵام لە پێناسەدا جیاوازن.

ناتوانین پەڵەی باران و پەڵەی سەر جل بە یەک پێناسە واتاکانیان ڕوونبکەینەوە. ئەو شتانەی ناویان هاوبەشە و یەک پێنناسەشیان بۆ دەکرێت هاوواتان. چۆلەکە و مراوی باڵندەن. لێرەدا (باڵندە) ناوی هاوبەشە بۆ هەردووکیان و لە پێناسەکردنیشدا یەک واتایان هەیە و بە باڵندە دادەنرێن. هەندێک لە شتەکان ناوەکانیان لە سەرچاوەیەکەوە هاتوە، بەڵام کۆتاییەکەیان جیاوازە بە هاوسەرچاوە دادەنرێن. بۆ نموونە نان و نان کەر، شاخ و شاخەوان یان نوسین و نوسەر. پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە ئەریستۆ باسی ئەو شتانە دەکات، کە بە تەنیا بە بێ بەستنەوەیان بە شتەکانی دیکەوە ڕادەوەستن و لە ڕێگەیانەوە ڕۆشنایی دەخەینە سەر بوون. ئەم شتانە بە کاتیگۆرییەکان دادەنێت.

هەندێک لەو باوەڕەدان ئەریستۆ ڕوونینەکردۆتەوە چۆن کاتیگۆرییەکانی دۆزیوەتەوە؛ بەڵام ئەگەر سەرنجێکی ئەو کاتیگۆرییانە بە وردی بدەین، دەردەکەوێت ئەریستۆ بە ڕێگەی بیرکردنەوەیەکی هۆشەکی و ئیندەکشنەوە کاتیگۆرییەکانی دۆزیوەتەوە و لە شتە هەندەکییەکانەوە بۆ چەمکە هەمەکییەکان چووە. لێمان دەپرسن،

ئەو شتە چۆنە؟ لە وەڵامدا دەڵێین شتێکی سورە. ئایا سور چیە؟ سور ڕەنگە. ئایا ڕەنگ چیە؟ ڕەنگ چۆنیەتییە. لێرەدا ڕادەوەستین و شتێکی هەمەکیتر نادۆزینەوە و چۆنیەتی بەو کاتیگۆرییە دادەنێین، کە لایەنێکی بوونمان بۆ دەردەخات. دەتوانین بە هامان ڕێگە کاتیگۆرییەکانی دیکەش بدۆزینەوە. وەکو باسم کرد، ئەریستۆ (دە) کاتیگۆری ڕیزکردوە. کاتیگۆرییەکانیش ئەمانەن: جەوهەر، چۆنیەتی، چەندەکی، پەیوەندی، دۆخ، حاڵەت، کات، شوێن، کارتێکردن، کارتێکراو.

جەوهەر لەنێو هەموویاندا ئەو کاتیگۆرییەیە، کە بە هیچ شێوەیەک گۆڕانی تیادا ڕوونادات و هەمان کات نابێت بە بار بۆ کاتیگۆرییەکانی دیکە. بەڵام هەموو کاتیگۆرییەکان بارن بۆ جەوهەر و جەوهەر دەبێت بە بارهەڵگری هەموویان. جەوهەریش نەگۆرە چونکە لایەنی پێچەوانەی نیە. شتێک دەگۆڕێت، کە لایەنی پێچەوانە و دژی هەبێت، بەڵام جەوهەر نە پێچەوانە نە دژی هەیە. هەروەها دوو جۆر جەوهەریش هەن:

جەوهەری یەکەم، کە بوونی تاکەکانە، وەکو سوکرات. جەوهەری دووەم. کە جۆری بچوکە، بۆ نموونە (فەیلەسوف) جۆری بچوکە، کە هەموو فەیلەسوفەکان تیایدا کۆدەبنەوە. لەمەش جۆری گەورەتر هەیە (مرۆڤ)، کە لەنێویدا فەیلەسوف و نافەیلەسوف کۆدەبنەوە، لەمەش گەورەتر جۆری ئاژەڵە، کە هەموو مرۆڤێک و ئاژەڵێک تیایدا کۆدەبنەوە.

بە دیدی ئەریستۆ جۆری بچوک جەوهەرە، چونکە ئەم جۆرە لە جەوهەری یەکەمەوە یان تاکەکانەوە نزیکترە. ئێمە باشتر لە واتای

دەستەواژە یان پێناسەکەمان تێدەگەین، ئەگەر جۆرێکی بچوک لەگەڵ تاکێکدا دابنێین و بڵێین (سوکرات فەیلەسوفە.) نەک (سوکرات ئاژەڵە.) (فەیلەسوف) جۆری بچوک و (ئاژەڵ) جۆری گەورەیە.

جەوهەر نەگۆڕە. سوکرات، وەکو جەوهەر لەوە زۆرتر نابێت بە مرۆڤ. بەڵام گۆڕانکاری لە سێ کاتیگۆرییدا بۆ جەوهەر ڕوودەدات. ئەو کاتیگۆرییانەی گۆڕانیان بەسەردا دێت، چۆنیەتی و چەندەکی و شوێنە. سوکرات دەبێت بە دارتاش، وەزنی کەم و زۆر دەبێت، بەیانیان لە ماڵەوە دەردەچێت و بە پێ بۆ ناو بازاڕ دەڕوات. ئەمانە سێ جۆر گۆڕانن لە بووندا ڕوودەدەن. لە پەرتووکی مێتافیزیکدا، ئەریستۆ لە جۆرێکی دیکەی گۆڕان دەدوێت، کە پەیوەندی بە پێکهێنان و تێکشکانەوە هەیە. بەشێک یان هەمووی شتێک لەناودەچێت و پێکدێت. ئەمە تەنیا گۆڕانێکە بە تایبەتی لە حاڵەتی پێکهێنان یان لەناوچوونی تاکێکدا بە تەواوی گۆڕان بەسەر جەوهەرەکدا دەهێنێت، ئەگینا بۆ ئەریستۆ جەوهەر نەگۆڕە و وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

محەمەد کەمال
زانکۆی مالبۆرن
٢٠٠٩

١. ئەو شتانەی تەنیا ناویان هاوبەشە و لە پێناسەدا جیاوازن بە (هاودەنگ) ناوزەد دەکرێن. بۆ نموونە، مرۆڤ و ئەو مرۆڤەی لە وێنەکەدایە، هەردووکیان ئاژەڵن و ناوێکی هاوبەشیان هەیە، بەڵام لە پێناسەدا جیاوازان: ئەگەر کەسێک بیەوێت باسی بوونی ئاژەڵ بکات بۆ هەر یەکێک لەو دوو شتە پێناسێکی جیاواز دادەنێت.

ئەو شتانەی ناوێکی هاوبەشیان هەیە و یەک پێناسەشیان بۆ دادەنرێت بە (هاوواتا) ناوزەد دەکرێن. کەوابوو، بۆ نموونە، مرۆڤ و گا ئاژەڵن. بە هەردووکیان دەوترێت ئاژەڵ و پێناسەکردنیشیان جیاواز نیە. ئەگەر کەسێک بیەوێت باسی بوونی هەر یەکێک لەو دووانە بکات یەک پێناسەیان بۆ دادەنێت. ئەو شتانەی ناوەکانیان لە سەرچاوەیەکەوە هاتووە، بەڵام کۆتاییەکانیان جیاوازە بە (هاوسەرچاوە) ناوزەد دەکرێن، بۆنموونە، وشەی ڕێزماننناس لە ڕێزمانەوە و ئازا لە ئازایەتییەوە وەرگیراوە.

٢. ئەو شتانەی باسمانکردن هەندێکیان پێکەوە و ئەوانی دیکەیان پێکەوە نین. نموونەی ئەو شتانەی پێکەوەن ئەمانەن: مرۆڤ ڕادەکات، مرۆڤ دەیباتەوە. ئەوانەی پێکەوە نین، لەم نموونانەدا، وەکو، مرۆڤ و گا، ڕادەکات و دەیباتەوە دەردەکەون.

هەندێک لە شتەکان هەن، (ا) پێیان دەوترێت بارهەڵگر (subject) بەڵام خۆیان لەنێو هیچ بارهەڵگرێکدا نین. بۆ نموونە،

مرۆڤ بارهەڵگرە. (ب) هەندێک لە شتەکان لەنێو بارهەڵگردان و خۆیان بارهەڵگر نین.(مەبەستم لەنێو بارهەڵگر لەوەیە، کە لەنێو بارهەڵگردایە، نەک وەکو بەشێکی، هاوکات بە بێ ئەو شتەی لەناویدایە ناتوانێت هەبێت). بۆ نموونە، زانیاری لە بارەی ڕێزمانەوە لەنێو بارهەڵگرەکەدایە، کە دەروونە، بەڵام ئەو زانیارییە بارهەڵگری پێناوترێت. هەروەها ڕەنگی سپی لەنێو بارهەڵگردایە، وەکو لەش (چونکە هەموو ڕەنگەکان لەنێو لەشدان). بەڵام بارهەڵگریان پێناوترێت.

(س) هەندێکیان بارهەڵگریان پێدەوترێت و لەنێو بارهەڵگرێکی دیکەشدان بۆ نموونە، زانین لەنێو دەروونندایە، وەکو زانینی ڕێزمانیش بە بارهەڵگر دادەنرێت. (د) هەندێک شت بارهەڵگر نین و لەنێو بارهەڵگریشدا نادۆزرێنەوە، بۆ نموونە تاکە کەس، یان تاکە ئەسپێک. ئەو شتانەی تاکن و بە ژمارەش یەکن، بە بێ جیاکاری، بارهەڵگریان پێناوترێت. بەڵام بۆ هەندێ کەسیش هیچ ڕێگرێک نیە تاکو ئەم شتانە لەنێو بارهەڵگردادابنێن.زانینی-ڕێزمانی لەنێو بارهەڵگردایە.

٣. هەرشتێک ببێت بە بار بۆ بارهەڵگرێک[بکەرێک]، ئەوەی سەبارەت بارەکە دەگوترێت، بۆ بارهەڵگرە کەشە. بۆ نموونە، مرۆڤ دەبێت بە بار بۆ بارهەڵگری تاکە کەس، هەروەها ئاژەڵیش دەبێت بە بار بۆ تاکە کەس چونکە تاکە کەس مرۆڤە و ئاژەڵیشە.
جیاوازی لە جۆرەکاندا ئەوە ناگەیەنێت جۆرێک دەکەوێتە ژێر دەستەڵاتی جۆرێکی دیکەوە، تەنیا جیاوازییان دەردەخات. بۆ نموونە، ئاژەڵ و زانین: پادار، باڵدار، زیندەوەری نێو ئاو، دوو پا، جیاوازن، بەڵام جیاوازی لە زانیندا نیە؛ زانینێک لەوی دیکەوە بە

دوو پا جیا نابێتەوە. هەمان کات هیچ شتێک نابێت بە ڕێگر لە ئاستی جۆرێک جۆریکی دیکە بخاتە ژێر دەستەڵاتییەوە، کە هەمان جیاوازییان هەیە. هەموو جۆرێکی گەورە بارە بۆ جۆرێکی بچوک. لەم ڕووەوە جیاوازییەکان لەنێو جۆرەکاندا، کە بە بار دادەنرێت بۆ بارهەڵگرەکە [بکەرەکە]ش جیاوازییە.

٤. ئەو شتانەی پێکەوە نین، هەر یەکێک لە ئەوان جەوهەر، چەندەکی، چۆنیەتی، پەیوەندی، شوێن، کات، دۆخ، کردار یان کارتێکردنە. بە کورتیەکەی، نموونەی جەوهەر مرۆڤ و ئەسپە؛ چەندەکی چوار پا یان پێچ پایە؛ چۆنیەتی سپی یان ڕێزمانییە؛ پەیوەندی دووانەیە، نیوە، گەورەترە؛ شوێن لە لیکیۆمە یان لەنێو بازاڕە؛ کات دوێنی یان پار، دۆخ درێژبووە، دانیشتوە؛ کردار پێڵاولەپێ دەکات یان چەک هەڵدەگرێ؛ کارتێکراویش، وەکو بڕاوە یان سوتاوە.

هیچ لەوانەی لە سەرەوە ڕیزمان کردن بە تەنیا و بە بێ شتێکی دیکە نیە. لەگەڵ پێکەوە دانانی ئەوانە سەلماندنیش دروستدەکەین. سەلماندنیش ڕاست یان ناڕاستە؛ بەڵام ئەو شتانەی تەنیان و لەگەڵ شتێکی دیکەدا پێکەوە دانانرێن، ڕاست یان ناڕاست نین (بۆ نموونە، مرۆڤ، سپی، ڕادەکات، دەیباتەوە).

٥. (جەوهەر) بەو شتە دەوترێت لە بنەڕەتدا و بە گشتی بۆ بارهەڵگر دانانرێت و لەنێو بارهەڵگریشدا نیە، بۆ نموونە تاکە کەس یان تاکە ئەسپێک جەوهەرە. ئەو جۆرانەی ئەم جەوهەرانەیان تێدایە پێیان دەوترێت جەوهەری دووەم. ئەمانە جۆری گەورەتریش دەگرنەوە.[١]

١ - جۆری گەورەم بۆ Genus و جۆری بچوکم بۆ Species داناوە. بۆ نموونە ئاژەڵ لە بەرانبەر مروف جۆرێکی گەورەیە و جۆرێکی بچوک (مروڤ) لەنێو خۆیدا هەڵدەگرێت. (وەرگێڕ)

مرۆڤە تاکەکان سەر بە جۆری مرۆڤن. ئاژەڵیش دەبێت بە جۆری گەورە بۆ مرۆڤ. مرۆڤ و ئاژەڵ جەوهەری دووەمن.
بە گوێرەی باسەکەی پێشتر دەردەکەوێت ئەوەی لە بارەی بارهەڵگرەوە دەوترێت ناوەکەی و پێناسەکەشی دەبن بە بار بۆی. بۆ نموونە، مرۆڤ بارە بۆ تاکە کەس. ناوی (مرۆڤ) و پێناسەکەشی بۆ ئەم تاکە کەسە دادەنرێت. ئەو شتانەی لەنێو بارهەڵگردان، زۆربەی کات ناو و پێناسەیان بۆ بارهەڵگرەکە دانانرێن. بەڵام هەندێک جار هیچ شتێک ڕێگەمان لێناگرێت .

ئەم کارەبکەین. هەمان کات مەحاڵە پێناسەکەی بکەین بە بار بۆ بارهەڵگرەکە. ڕەنگی سپی، کە لە بابەتێکی سپیدایە بارە بۆ بارهەڵگرەکە و دەڵێین ئەو بابەتە سپییە. بەڵام پێناسەی ڕەنگی سپی هەرگیز نابێت بە بار بۆ سپییەکە. هەموو ئەو شتانەی بە جەوهەری یەکەمییان دادەنێین بارهەڵگرن یان لەنێو بارهەڵگرەکاندا دەردەکەون. ئەمەش لەو نموونەیەدا باشتر ئاشکرا دەبێت، کە ئەگەر ئاژەڵ بە بار بۆ هیچ مرۆڤێکی تاک دانەنرێت ئەوا هەرگیز ناتوانین بیکەین بە بار بۆ بوونی مرۆڤ. هەروەها، مادامەکی ڕەنگ بە لەشەوەیە ئەوا دەبێت لەنێو لەشێکی تاکیشدا هەبێت؛ ئەگەر ڕەنگ لەنێو هیچ[بابەتێک] یان لەشێکی تاکدا نەبێت هەرگیز نادۆزرێتەوە.[٢] کەوابوو، هەموو ئەو شتانەی بە جەوهەری یەکەمییان دادەنێین بارهەڵگرن یان لەنێو بارهەڵگردا هەن. ئەگەر جەوهەری یەکەم نەبێت بوونی هەموو شتەکانی دیکە

٢ - ئەم بۆچوونەی ئەریستۆ دژی بۆچوونی ئەفلاتونە. بۆ ئەفلاتون فۆرمە هەمەکییەکان بە بێ بابەتە هەندەکییەکان دەتوانن هەبن. بۆ نموونە ڕەنگی هەمەکی سپی خاوەنی بوونی خۆیەتی و لە جیهانی بەرزدا بە بێ بابەتە سپییە هەندەکییەکان هەیە. (وەرگێڕ)

مەحاڵ دەبێت.[٣]
لەنێوان جەوهەرە دووەمەکاندا جۆری بچوک زۆرتر لە جۆری گەورە بە جەوهەر دادەنرێت، چونکە لە جەوهەری یەکەمەوە نزیکە.

کەسێک بیەوێت باسی جەوهەری یەکەم بکات، باشترە و زانیاری زۆرتریش بە ئێمە دەدات ئەگەر جۆری بچوکی ئەو جەوهەرە دەستنیشان بکات. باشترە بڵێین تاکە کەس مرۆڤە لەوەی بە ئاژەڵی ناوزەدی بکەین (یەکەمیان لە تاکە کەسەوە نزیکترە و دووەمیان شتێکی گشتییە)؛ زۆرتریش زانیاریمان دەست دەکەوێت ئەگەر بڵێین ئەوە درەختە لەوەی  بە ڕووەک پێناسی بکەین. لەسەر و ئەمەوە، جەوهەری یەکەم هەمیشە بارهەڵگرە و هەموو شتەکانی دیکە دەبن بە بار بۆ ئەو وەکو جەوهەری یەکەم بۆ شتەکان و جۆری بچوکیش بۆ جۆری گەورە ڕادەوەستن: جۆری بچوک دەبێت بە بارهەڵگری جۆری گەورە. لەبەر ئەمە جۆری بچوک زۆرتر لە جۆری گەورە بە جەوهەر دادەنرێت.[٤] بەڵام جۆرە بچوکەکان، ئەوانەی گشتی نین، لەوە زۆرتر نابن بە جەوهەر: ناگونجێت بڵێین تاکە  مرۆڤەکە مرۆڤە یان تاکە ئەسپەکە ئەسپە. لەنێو جەوهەرە یەکەمەکانیشدا هیچیان لەوی دیکەیان زۆرتر جەوهەر نیە. تاکە کەسێک لە تاکە گایەک زۆرتر بە جەوهەر دانانرێت. دەگونجێت لە دوای جەوهەری یەکەمەوە جۆری بچوک یان گەورە بە جەوهەری دووەم دابنێین چونکە ئەوان دەبن بە بار بۆ جەوهەری یەکەم و جەرهەری یەکەمیش بەرجەستە

---

٣- مەبەستی ئەریستۆ ئەوەیە، ئەگەر بابەتە تاکەکان نەبن خەسڵەتە هەمەکییەکانیش نابن. ئێمە ڕەنگی سپی لەنێو شتێکی هەندەکی سپیدا دەدۆزینەوە. (وەرگێڕ)

٤- لە دەستەواژەی (مرۆڤ ئاژەڵە) مرۆڤ جۆری بچوکە و ئاژەڵیش جۆری گەورە. هەروەها لەم دەستەواژەیەدا (مرۆڤ) بارهەڵگر یان بکەرە و (ئاژەڵ) بارە. (وەرگێڕ)

دەکەن. ئەگەر کەسێک بیەوێت بزانێت تاکە کەس چییە، ئەوا دەبێت ئاماژە بۆ جۆری بچوک یان جۆری گەورەی تاکەکەس بکات. هەرچ شتێکی دیکە باس بکات زانیارییەکەمان ناداتێ. بۆ نموونە ئەگەر بڵێت (ئەو تاکە کەسە) ڕەنگی سپییە یان ڕادەکات یان هەر شتێکی دیکە لەم بابەتانە بێت، تاکە کەسەکەمان پێناناسێنێت. لەبەر ئەمە ئەوانە شیاوی ئەوەن بە جەوهەر دابنرێن. هەروەها، جەوهەری یەکەم بارهەڵگری هەموو شتێکە بە بێ کەم و کورتی و لادان بە جەوهەر ناوزەدی دەکەین. مادامەکی جەوهەری یەکەم بەرانبەر هەموو شتێک ڕادەوەستێت و[دەبێت بە بارهەڵگر] ئەوا جۆری بچوک و گەورەش بەرانبەر شتەکانی دیکە ڕادەوەستن و دەبن بە بار بۆیان. ئەگەر تۆ بە تاکە کەسێک بڵێیت ڕیزمانناس ئەوا مرۆڤ و ئاژەڵیش بە ڕێزماننناس دادەنێیت.

خەسڵەتی جەوهەر ئەوەیە، کە لەنێو بارهەڵگردا نیە. جەوهەری یەکەم بۆ بارهەڵگر دانانرێت و لەنێویشیدا نیە. هەروەها ئاشکرایە جەوهەری دووەمیش لەنێو بارهەڵگردا نیە. مرۆڤ دەکرێت بە بار بۆ تاکە کەس، بەڵام لەنێو تاکە کەسدا نیە. بە هەمان شێوە، ئاژەڵ دەبێت بە بار بۆ تاکە کەس، بەڵام لەنێو تاکە کەسدا نیە. سەرەڕای ئەمەش، هەرچەندە هیچ ڕێگرێک نیە، تاکو ئەوەی لەنێو بارهەڵگرەکەدایە بکرێت بە بار بۆی هێشتا مەحاڵە پێناسەکردن بە بار دابنرێت. بەڵام پێناسەکردنی ناوڕۆکی دووەم و ناو دەبن بە بار. تۆ دەتوانیت پێناسەی مرۆڤ یان ئاژەڵ بۆ تاکە کەسێک بکەیت بە بار. بەڵام هێشتا هیچ جەوهەرێک لەنێو بارهەڵگردا نیە. ئەوە تەنیا خەسڵەتی جەوهەر نیە چونکە جیاوازیش ناکەوێتە نێو بارهەڵگرەوە. ئەو کاتەی مرۆڤ بە دووپا پێناسدەکەین، ئەم بارە[جیاوازییە]

لەنێویدا نیە؛ نە پا و نە دووپا لەنێو بارهەڵگر (مرۆڤ)دایە. هەروەها پێناسەکردنی جیاوازی بۆ ئەو شتەی جیاوازە و باسیکراوە دەبێت بە بار. بۆ نموونە، ئەگەر مرۆڤ بە پادار بناسرێت پیناسەی (پادار) بۆ مرۆڤیش دادەنرێت چونکە مرۆڤ پادارە.

نابێت لەوەش بترسین، کە بەشەکانی جەوهەر لەنێو بارهەڵگرێکدا بە جەوهەر دانەنێین. ئێمە لە باسکردنەکەمان لەو شتانەی لەنێو بارهەڵگردان مەبەستمان لە بەشەکانی نەبوو.

جەهەر و جیاوازیی هەموو ئەو شتانەی هەیانە هاوواتابن بارەکانیان بە تاکەوە یان بە جۆری بچوکەوە گرێدراون. (جەوهەری یەکەم نابێت بە بار و لە جەوهەری دووەمیشدا جۆری بچوک دەبێت بە بار بۆ تاکەکان و جۆری گەورەش بۆ جۆری بچوک و تاکەکانیش.) تاکەکان بە ڕێگەی جۆری بچوک و خەسڵەتی گشتی و جۆری بچوکیش بە ڕێگەی جۆری گەورەوە پێناس دەکرێت. بە هەمان شێوە، تاکەکان و جۆری بچوک لە پێناسەکردنیاندا پێویستیان بە جیاوازییە. ئەو شتانەی هاو واتان ئەوانەن بە ناو هەروەها لە پێناسەدا وەکو یەکن. لەم ڕووەوە هەموو ئەوانە بە جەوهەرن و جیاوازی هاوواتاییان هەیە. هەموو جەوهەرێک ئاماژە بۆ (ئەو) شتە دەکات. جەوهەری یەکەم، بێ مشتومڕ لەسەری، ئاماژە بۆ (ئەو) شتەدەکات. ئەوەی جەوهەری یەکەم دەریدەخات تاکە و بە ژمارەش یەک شتە. هەرچەندە جەوهەری دووەم بە گوێرەی ناوەکەی دەردەکەوێت- کاتێک باسی مرۆڤ یان ئاژەڵ دەکرێت- ئاماژە بۆ (ئەو) شتە بکات، بەڵام ئاماژەکردنەکەی ڕاست نیە. ئەو ئاماژە بۆ جۆرێک خەسڵەت دەکات. جەوهەری یەکەم یەک شتە، بەڵام مرۆڤ

یان ئاژەڵ زۆر شتن. هەروەها ئاماژە بۆ خەسڵەتێکی سادەی وەکو ڕەنگی سپیش ناکات. ڕەنگی سپی بێجگە لە خەسڵەت هیچی دیکە نیە. جۆری بچوک و گەورە، بە پێچەوانەوە، خەسڵەتی جەوهەر دیاریدەکەن. یەکێک لە خەسڵەتەکانی دیکەی جەوهەر ئەوەیە، کە پێچەوانەی نیە. ئایا ئەو شتە چییە، کە دەبێت بە پێچەوانەی جەوهەری یەکەم؟ تاکە کەس، مرۆڤ یان ئاژەڵ هیچ شتێکیان بە پێچەوانەوە نیە. ئەم خەسڵەتە بێجگە لە جەوهەر لە زۆر شتی دیکەشدا دەدۆزرێتەوە. بۆ نموونە، چەندەکیش. هیچ شتێک پێچەوانەی چوار پێ، دە یان گەورە و بچوک نیە؛ چەندەکییەکی دیاریکراو لە پێچەوانە بەدەرە.

وادەردەکەوێت، کە جەوهەر کەم و زیاد ناکات. مەبەستم ئەوە نیە، کە جەوهەرێک لە جەوهەرێکی دیکە زۆرتر جەوهەر نیە. بەڵکو ئەو جەوهەرەی هەیە لەوە زۆرتر یان کەمتر بە جەوهەر نابێت. گریمان ئەو جەوهەرە مرۆڤە، ئەوا ئەو مرۆڤە لەوە زۆرتر یان کەمتر نابێت بە مرۆڤ یان لە مرۆڤێکی دیکەش زۆرتر مرۆڤ نیە؛ ڕەنگی زەرد لە ڕەنگی زەردی دیکە زەردتر نیە و شتێکی جوانیش لە شتێکی جوانی دیکە جوانتر نیە. هەمان کات کەمی و زۆری لە شتێکدا باسدەکرێت. ئەو بابەتەی ئێستا زەردە لەوانەیە لە جارانی زەردتر بێت. ئەوەی گەرمە لە جارانی گەرمترە یان ساردترە. بەڵام بەم شێوەیە باسی جەوهەر ناکرێت. ئەو کەسەی ئێستا مرۆڤە لە جاران زۆرتر مرۆڤ نیە. لەبەر ئەمە جەوهەر کەم و زۆر ناکات.

وادیارە یەکێک لەو لایەنانەی جەوهەر ئەوەیە، کە هەرچەندە بە ژمارە یەکە و وەکو خۆیەتی، پێچەوانە وەردەگرێت. لە هیچ حاڵەتێکی

دیکەدا کەس ناتوانێت پێچەوانە بەو شتە بدات، کە بە ژمارە یەکە و وەکو خۆیەتی. ئەو ڕەنگەی یەک جۆرە و وەکو خۆیەتی ڕەش و سپیش نیە. شتێک باش و خراپ نیە. بەڵام جەوهەر، کە بە ژمارە یەکە و ناگۆڕێت دەتوانێت پێچەوانە وەرگرێت. تاکە کەسێک جارێک ڕەنگی زەرد و جارێکی دیکەش ڕەش دادەگەڕێ، گەرم و ساردیشە، یان کەسێک چاکە و خراپ دەبێت. هیچ شتێکی دیکە ئەم خەسڵەتەی نیە. مەگەر کەسێک بڵێت، دەستەواژەکان و باوەڕ بەم شێوەبن. دەستەواژە ڕاست یان ناڕاستە. گریمان دەستەواژەی (ئەو کەسە دانیشتوە) ڕاستە؛ بەڵام ئەو کاتەی ئەو کەسە هەڵدەسێت دەستەواژەکە ناڕاست دەردەچێت. باوەڕیش بەم شێوەیەیە. تۆ لەو باوەڕەدای ئەو کەسە دانیشتوە، کاتێک هەڵدەسێت، ئەگەر هەمان باوەڕت هەبێت و نەیگۆڕی ناڕاست دەبێت. بە هەرحاڵ، وەرگرتنی پێچەوانەکان ڕێگەی جیاوازیان هەیە. جەوهەرەکان خۆیان گۆڕانەکان دەهێننە کایەوە و پێچەوانەکان وەردەگرن. ئەوەی گەرم یان ساردبووە، زەرد یان ڕەش، چاک یان خراپ گۆڕانی بەسەردا هاتوە. لە حاڵەتەکانی دیکەشدا ئەو شتانە خۆیان گۆڕانەکە دروستدەکەن. دەستەواژە و باوەڕ هەمیشە نەگۆڕن. ئەوەی دەگۆڕێ و پێچەوانە وەردەگرێت فاکتۆرەکەی نێو داکەوتە. دەستەواژەی (ئەو کەسە دانیشتوە) گۆڕانی بەسەردا نایەت. گۆڕان لە حاڵەتی[کەسەکەدا] دەستەواژەکە دەکات بە ڕاست و ناڕاست.

باوەڕیش بەم شیوەیە یە. هێشتا ئەمە خەسڵەتێکی تایبەتمەندی جەوهەرە؛ هەرچەندە دەستەواژە و باوەڕیش ناگۆڕێن و تەوانای وەرگرتنی پێچەوانەیان هەیە. لە حاڵەتی دەستەواژە و باوەڕدا گۆڕانەکە لە شتێکی دیکەدا ڕوویداوە. دەستەواژە و باوەڕ شتێکی

نەگۆڕن. لەم حاڵەتەشدا، مادامەکی هیچ گۆڕانێکیان تێدا ڕوونادات پێچەوانەش وەرناگرن.

جەوهەر دەتوانێت پێچەوانە وەرگرێت. جەوهەر خۆی نەخۆش دەکەوێت یان تەندروستی چاک دەبێت، زەرد دەبێت یان ڕەش دادەگەڕێت. کەوابوو، ئەوەی پێچەوانە وەردەگرێت ئەو جەوهەرەیە، کە وەکو خۆیەتی و بە ژمارەش یەکە. ئەمەش کۆتایی بە باسەکەمان لەسەر جەوهەر دەهێنێت.[٥]

٦. (چەندەکییەکان) پچڕ پچڕ و نابەردەوام و ئەوانی دیکەیان بەردەوامن. هەندێکیان لە بەشەکان پێکهاتون و پەیوەندییان بە یەکدییەوە هەیە. ئەوانی دیکەیان لە بەشەکان پێکنەهاتون.

ئەوانەی نابەردەوامن ژمارە و زمانن؛ بەردەوامە کانیش هێڵ و ڕووبەر و تەن، لەگەڵ ئەمانەدا کات و شوێنن. بەشەکانی ژمارە سنورێکی هاوبەشیان نیە تیایدا یەک بگرن. ئەگەر پێنج بەشێک بێت لە ژمارە (دە) ئەوا دوو ژمارەی (پێنج) لە هیچ شوێنێکدا یەک ناگرن و دوو ژمارەی لە یەکدی دابڕاون. تەنانەت ژمارە سێ و حەوتیش بە یەکدی ناگەن. تۆ لە هیچ شوێنێکدا سنورێکی هاوبەش بۆ ژمارەکان نادۆزیتەوە.

ژمارەکان هەمیشە لە یەکتر دابڕاون و پچڕاون. کەوابوو، ژمارە چەندەکییەکی نابەردەوامە. زمانیش چەندەکییەکی نابەردەوامە.

---

٥ - ئەریستۆ لەو باوەڕەدایە جەوهەر نەگۆڕە چونکە پێچەوانەی نیە، بەڵام پێچەوانە وەردەگرێت.(وەرگێڕ).

(زمان چەندەکییە چونکە بە درێژی و کورتی بڕگەکان دەپێورێت؛ مەبەستم لە زمان گوتەیە)، بەشەکانی لە هیچ سنورێکی هاوبەشدا ناگەن بە یەکدی. سنورێکی هاوبەش بۆ بە یەک گەیشتنی بڕگەکان نیە. هەر یەکێک لە بڕگەکان جیایە. هێڵیش [بە پێچەوانەوە] چەندەکییەکی بەردەوامە. دۆزینەوەی سنورێکی هاوبەش، کەتیایدا بەشەکانی بە یەکدی دەگەن ئاسانە، کە بە خاڵ دادەنرێت. بۆ ڕووبەریش سنورەکە هێڵە. بە هەمان شێوە، بۆ تەن هێڵ یان ڕووبەرە، کە بەشەکانی تیایدا بە یەکدی دەگەن. کات و شوێنیش بەم جۆرەن و لە سنورێکی هاوبەشدا بە یەکدی دەگەن. ئەو کاتەی لە ئێستادایە لە هەر دوو سەرەوە بە ڕابردوو هەروەها داهاتووەوە بەستراوە. شوێنیش بەردەوامییە. بەشەکانی شوێن تەنەکان داگیریان کردووە و لەوێدا یەک دەگرن، کە تەنەکان بە یەکدی دەگەن.

لەسەرو ئەمانەوە، هەندێک چەندەکی لە بەشەکان پێکهاتون، کە لە دۆخێکدا پەیوەندییان لەگەڵ یەکدیا هەیە. بەشەکانی هێڵ پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە. هەر یەکێک لەوان دەکەوێتە شوێنێکەوە و دەتوانین لەوانی دیکەی جیابکەینەوە. هەروەها، بەشەکانی ڕووبەریش لە جێگای خۆیاندا دانراون و پەیوەند ییەکەیان ئاشکرایە. بەشەکانی تەنیش بە هەمان شێوە. لە بەشەکانی ژمارەدا ئەم جۆرە پەیوەندییە نادۆزرێتەوە. بەشەکانی کاتیش بەردەوامییان نیە. چۆن شتێک بەردەوام نەبێت لەنێو دۆخدا دەبێت؟ لەوانەیە تۆ بڵێیت جۆرە ڕیزدانانێکیان هەیە، وەکو دەبینین بەشەکانی کات پێش و پاش دەکەون. ژمارەکانیش هەندێکیان پێشتر و ئەوانی دیکە پاشتر دەژمێردرێن. ژمارە دوو پێش ژمارە سێ دێت. لەبەر ئەمە ڕیزکراون، بەڵام دۆخیان نیە. زمانیش بە هەمان شێوە. هیچ بەشێکی بەردەوام

نیە. ئەوەی کە گوتراوە جارێکی دیکە ناگیرێت. لەبەرئەمە بەشەکانی دۆخیان نیە. هەندێک چەندەکی لە بەشەکان پێک هاتون و دۆخیان هەیە، ئەوانی دیکەش لە بەشەکان پێک هاتون، بەڵام دۆخیان نیە. ئەو شتانەی باسمانکردن بە تەواوی چەندەکین؛ ئەوانی دیکەش لەم چەندەکییانەوە دەرچوون؛ ئەو کاتەی لە چەندەکی ئەم شتە دەرچووانە دەدوێین بۆ چەندەکییەکانی پێشوتر دەگەڕێینەوە، کە بە تەواوی بە چەندەکی دانراون. بۆ نموونە، باسی تەنێکی گەورەی سپی دەکەین چونکە ڕووبەری ئەو تەنە گەورەیە یان ڕووداوێک، گۆڕانێک بە درێژخایەن دادەنرێت، چونکە کاتەکەی درێژخایەنە. هەر یەکێک لەم شتانە لەنێو خۆیاندا چەندەکی نین و پەیوەندییان بە چەندەکییەوە هەیە. ئەگەر یەکێک بیەوێت درێژی ڕووداوەکە بزانێت، بە کات دەیپێوێت و دەڵێت ساڵێک یان کەمتر لە ساڵێکی خایاند. چەندییەتی ڕەنگی سپیش لە تەنەکەدا پەیوەندی بە ڕووبەرەکەوە هەیە و دەکەوێتە سەر گەورەیی و بچوکی قەوارەکەی. تەنیا ئەوانەی باسمانکردن بە تەواوی بە چەندەکی دادەنرێن. هەر شتێکی دیکە بێجگە لەمانە پەیوەندییان بەم چەندەکییانەوە هەیە.

هەروەها، چەندەکی پێچەوانەی نیە. چەندەکی تەواو لە پێچەوانە بەدەرە. پێچەوانەی چوار پێ، پێنج پێ یان ڕووبەر نادۆزرێتەوە. لەوانەیە هەندێک واتێبگەن، کە (زۆر) پێجەوانەی (کەم) و (گەورە) ش پێچەوانەی (بچوک)ە. ئەمانە پێچەوانە نین، بەڵام چەندەکیین و پەیوەندییان بە یەکدییەوە هەیە. ئەگەر شتێکی بچوک نەبێت، شتێکی دیکە بە گەورە دانانرێت. هەندێک جار چیایەک بە بچوک و درەختێک بە گەورە دادەنێین چونکە چیاکە لەنێو جۆرەکەی خۆیدا بچوکە و درەختەکەش گەورەیە. ئەگەر ئەم شتانە چەندەکییان لەنێو

خۆیاندا هەبێت و ئاماژە بۆ پەیوەندییەکەیان بە شتێکی دیکەوە نەکرێت ئەوا ناتوانین چیاکە بە بچوک و درەختەکە بە گەورە دابنێین. لە نموونەیەکی دیکەدا دەڵێین، دانیشتوانی ئەو گوندە زۆر و دانیشتوانی شاری ئەسینا کەمە. لە ڕاستیدا دانیشتوانی شاری ئەسینا چەندجارێک لە دانیشتوانی گوندەکە زۆرترە. هەروەها دەڵێین خەڵکێکی زۆر لەنێو خانوەکەدان و کەمیش بۆ شانۆگەرییەکە چوون، بەڵام لە ڕاستیدا ژمارەی ئەو کەسانەی بۆ شانۆگەرییەکە چوون لە ژمارەی ئەوانەی لەنێو خانوەکەدان زۆرترە. بێجگە لەمە، چوار پێ یان پێنج پێ چەندەکیین و ئاماژەش بۆ چەندەکی دەکەن. گەورە و بچوک ئاماژەی[ڕاستەوخۆ] بۆ چەندەکی ناکەن و پەیوەندی دەردەخەن. گەورە و بچوک واتاکەیان لە پەیوەندی بەشتەکانی دیکەوە ئاشکرا دەبێت. لەبەر ئەمە، ئەم چەمکانە پەیوەندیدارن. لەسەرو ئەمانەوە، گرنگ نیە ئەم چەمکانە بە چەندەکی دابنرێن یان نا، هێشتا پێچەوانەکانیان نادۆزرێتەوە. چۆن شتێک بە تەنیا و بە بێ پەیوەندی نەناسرێت پێچەوانەی دەبێت؟ ئەگەر گەورە و بچوک بە پێچەوانەی یەکدی دابنرێن، ئەوا شتێک لە یەک کاتدا پێچەوانەی بۆ دادەنرێت. لەم حاڵەتەدا شتەکان دەبن بە پێچەوانەی خۆیان. ئەگەر شتێک لە یەک کاتدا لە ئاستی شتێکدا گەورە و شتێکی دیکەدا بچوک بێت، ئەوا ئەو شتە لە یەک کاتدا گەورە و بچوکە و پێچەوانەی هەیە. بەڵام هیچ شتێک لە یەک کاتدا پێچەوانە وەرناگرێت. جەوهەر، بۆ نموونە، ئەگەر پێچەوانەشی هەبێت، لە یەک کاتدا ناتوانین بڵێین نەخۆشە و نەخۆشیش نیە یان زەرد و ڕەش داگەڕاوە؛ شتەکانی دیکەش بەم جۆرە پێچەوانەیان نیە. ئەگەر گەورە و بچوک بە پێچەوانە دابنرێن، ئەوا لەنێو هەموو شتێکدا پێچەوانەش سەرهەڵدەدات.

بەڵام مەحاڵە شتێک پێچەوانەی خۆی بێت. کەوابوو، گەورە پێچەوانەی بچوک نیە و زۆریش بە هەمان شێوە پێچەوانەی کەم نیە. ئەگەر کەسێک ئەم[چەمکانە] بە پەیوەندیشەوە نەبەستێتەوە و بە چەندەکییان دابنێت هێشتا نابن بە پێچەوانە بۆ یەکدی. یەکێک لە خەسڵەتەکانی چەندەکی یەکسانی و نایەکسانی یە. ئەو چەندەکییانەی باسیان دەکەین یەکسان و نایەکسانن. تەن یەکسان و نایەکسانە، هەروەها ژمارە و کات و شتەکانی دیکەش یەکسان و نایەکسانن. هەر شتێک لەنێو ئەم چەندەکییانەدا نەبێت یەکسان و نایەکسان نیە. بۆ نموونە بارودۆخێک یەکسان و نایەکسان نیە. لەبەر ئەمە یەکسان و نایەکسان خەسڵەتێکی تایبەتی چەندەکییە.

٧. بەو شتانە دەوترێت (پەیوەندیدار)، کە لەگەڵ شتەکانی دیکەدا پەیوەندییان هەیە. بۆ نموونە بەوە دەوترێت گەورە، کە لە شتێکی دیکە گەورەتر بێت، یان دووجار، کە لە ئاستی شتێکی دیکەدا دووجار بێت. هەموو ئەم شتانەی، وەکو حاڵەت، دۆخ، هەستکردن و زانین پەیوەندیدارن. هەر یەکێک لەمانە، کە باسدەکرێت پەیوەندی بە شتێکی دیکەوە هەیە. ئەو کاتەی دەڵێین چیاکە گەورەیە، گەورەیی چیاکە پەیوەندی بە شتێکی دیکەوە هەیە، هەروەها ئەوەی لێکچوە لە شتێکی دیکە دەچێت و بەم جۆرە ئەم پەیوەندییە بۆ هەموو ئەو شتانەی باسمانکردن دەدۆزرێتەوە. ڕاکشان، ڕاوەستان، دانیشتن جۆرێکن لە دۆخ؛ دۆخیش پەیوەندی دەردەخات. ڕاکشان و ڕاوەستان و دانیشتن بە تەنیا دۆخ نین. ئەمانە ناوەکەیان لە دۆخەکەوە وەرگرتوە. پەیوەندییەکان دژایەتییان تێدایە، بۆ نموونە چاکە و خراپە، زانین و نەزانین، دژوەستاون. بەڵام هەموو پەیوەندیدارەکان پێچەوانەیان نیە. پێچەوانەی دووقات، سێ قات و ئەوانەی لەم چەمکانە دەچن

نیە. دەردەکەوێت پەیوەندی زۆری و کەمی هەبێت. شتێک زۆرتر یان کەمتر لە شتێکی دیکە دەچێت، کەمتر یان زۆرتر یەکسان و نایەکسانن. هەر یەکێک لەمانە پەیوەندییە چونکە ئاماژە بۆ شتێکی دیکە دەکات. هێشتا ناتوانین بڵێین، هەموو پەیوەندییەک کەمی و زۆری هەیە، ئەوەی دووجارە بە دووقات زۆرتر لە شتێکی دیکەوە دانانرێت. هەموو پەیوەندییەکان لەگەڵ لایەنەکەی بەرانبەریان پەیوەندی دروستدەکەن. بە کەسێک دەوترێت کۆیلە، کە خاوەنی هەبێت و خاوەن کۆیلەش ئەو کەسەیە کۆیلەی هەبێت. دووقات دووقاتی نیوەیە، نیوەش نیوەی دووقاتە؛ ئەوەی گەورەیە بەرانبەر شتێکی بچوک گەورەیە و بچوکیش بە هەمان شێوە. هەندێک جار جیاوازی لەشێوازی دەربڕینەکەدا هەیە و فەرمانەکە لە کۆتاییەکەدا دەگۆڕێت.

زانین بەوە دەوترێت، کە زانراوە و ئەوەی زانراویشە بە زانین زانراوە؛ هەستکردن پەیوەندی بە هەستکراوەکەوە هەیە و ئەوەی هەستپێکراوە بە هەستکردن بووە بە هەستپێکراو.
هەندێک جار، ئەو کاتەی پەیوەندییەکە بە هەڵە دەستنیشان دەکرێت یان بە تەواوی نادۆزێتەوە وادەردەکەوێت دەستەوایی نەبن. ئەگەر باڵ بۆ مەل دابنێین مەل و باڵ پەیوەندییەکەیان دیارنابێت، چونکە باڵ بە تەواوی بۆ مەلەکە دانەنراوە و نەگوتراوە مەل ئەوەیە، کە باڵدارە. ئێمە تەنیا ئەوەمان دەرخستوە، کە ئەو بوونە باڵی هەیە. زۆر شتی دیکەش هەن مەل نین و باڵیان هەیە. لەم ڕووەوە ئەگەر بە دروستی باسبکرێن پەیوەندییەکەشیان بە تەواوی دەردەکەوێت. بۆ نموونە ئەگەر بڵێین باڵ باڵی ئەو بوونەیە، کە باڵدارە و ئەوەی باڵداریشە ئەو بوونە یە باڵی هەیە، باشترە.

هەندێک جار، ئەگەر ناوێک بۆ پەیوەندییەک نەبێت پێویستە ناو دابنێین. بۆ نموونە سوکان بۆ کەشتی دادەنێین، بەڵام دەزانین کەشتی بێ سوکانیش هەیە. لەم ڕووەوە پەیوەندییەکە مسۆگەر نیە. کەشتی ئەوە نیە سوکانی هەبێت. پەیوەندییەکە باشتر دەردەکەوێت ئەگەر بڵێین هەموو شتێکی سوکاندار سوکانی هەیە. لەم حاڵەتەدا پەیوندییەکە دیارە. سوکاندارەکە بە سوکان دەبێت بە سوکاندار. بە هەمان شێوە، ئەمە بۆ حاڵەتەکانی دیکەش دروستە. سەر، نەک تەنیا بۆ ئاژەڵ بەڵکو بۆ هەموو بوونێک دادەنرێت، کە سەری هەیە چونکە زۆر ئاژەڵ هەن سەریان نیە. ئەمە باشترین نموونەی ئەو شتانەیە، کە ناویان لێنەنراوە. ئەگەر ناوێک بۆ پەیوەندییە بنەڕەتییەکەیان دانرابێت ئەوا ناویش لە دەستەوایی کردنەکەیان دەنێین. ئەمەش لە نموونەی باڵدارەکە، کە لە باڵەوە و سوکاندارەکە لە سوکانەوە دامان ڕشت دەرکەوت. کەوابوو، هەموو ئەوانەی پەیوەندی دارن و باسمانکردن، دەستەوایی و ئاڵوگۆڕکردنیان هەیە ئەگەر بە تەواوی بەرابنەر یەکدی دابنرێن. ئەگەر شتێک بە دروستی بۆ بەرانبەرەکەی دانەنرێت، بۆ نموونە کۆیلە بەرانبەر مرۆڤێکی دووپا نەک خاوەن کۆیلە دابنریت، دەستەواییەکە دەرناخات. بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر ئەو شتە بە دروستی لە ئاستی بەرانبەرەکەیدا دانرابێت و لەو شتانە دورخرابێتەوە، کە بەڕوداو پەیوەندی لەگەڵییدا هەیە، ئەوا پەیوەندییەکە بە تەواوی دەردەکەوێت. ئەگەر پەیوەندی کۆیلە ڕاستەوخۆ بە خاوەن کۆیلەوە، نەک بەو کەسەوە دووپایە یان دەتوانێت فێربێت دابنرێت، ئەوا کۆیلە هەمیشە لەو پەیوەندییەدا لەگەڵ خاوەنەکەی بە تەواوی دەردەکەوێت. کۆیلە ئەو کەسەیە، کە خاوەن کۆیلەی هەیە. لە لایەکی دیکەوە، ئەگەر پەیوەندییەکە بە تەواوی دیاری نەکرابێت و ئاماژە بۆ ڕووداوەکان کرابێت، بە

لابردنی ڕووداوەکانیش پەیوەندییەک نادۆزرێتەوە. گریمان کۆیلە بەرانبەر مرۆڤ[نەک خاوەن کۆیلە] و باڵیش بەرانبەر مەل دادەنێن. ئەگەر مرۆڤ و مەل لابەرین، کۆیلەکە بەرانبەر مرۆڤ دانانرێت، چونکە بە بێ خاوەن کۆیلە کۆیلەش نیە. بە هەمان شێوەش لەگەڵ لابردنی مەلدا پەیوەندی باڵیش نامێنێت، چونکە باڵ بە بێ بوونێک، کە باڵدارە نیە. کەوابوو، پیویستە دەستەوایی پەیوەندییەکان بە دروستی دەستنیشان بکرێت. ئەگەر ئەو پەیوەندییە ناوی هەبێت دەستنیشانکردنەکەشی ئاسانە، ئەگینا دەبێت خۆمان ناوی بۆ دابنێین.

ئەو شتانەی پەیوەندیدارن پێکەوە لە یەک کاتدا دەردەکەون. ئەمەش زۆربەی کات ڕاستە. لە یەک کاتدا نیوە و دووقات هەن. ئەگەر نیوە هەبێت دووقاتیش دەبێت یان کۆیلە هەبێت خاوەن کۆیلەش هەیە. هەمان کات هەر یەکێک لەم لایەنانە دەبێت بە ڕووخێنەری لایەنەکەی دیکە. ئەگەر دووقات نەبێت نیوەش نیە.

هێشتا دروست نیە بڵێین هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیدارن پێکەوە لە یەک کاتدا سەرهەڵدەدەن. ئەوەی زانراوە پێش زانین دەکەوێت چونکە ئەوەی ئێمە لە بارەیەوە دەزانین شتێکە، کە لە داکەوتدا هەیە. لە هەندێک حاڵەتی کەمدا، ئەگەر هەبێت، زانین و زانراو پێکەوە لە یەک کاتدا سەرهەڵدەدەن. لەسەرو ئەمەشەوە، لەناوچوونی زانراو زانین لەناو دەبات، بەڵام نەمانی زانین نابێتە هۆی ڕوخانی شتە زانراوەکە. ئەگەر شتە زانراوەکە نەبێت زانینمان لە بارەیەوە نابێت. ئەگەر ئێمە لە بارەی شتێکەوە نەزانین ئەوە ناگەیەنێت، کە ئەو شتە نیە. بۆ نموونە، ئێمە هیچ لە بارەی ئەو بازنەیەوە نازانین، کە

چوا ر گۆشەی هەیە، بەڵام زانین[بە گشتی] هەیە. ئەگەر ئاژەڵێک نەمێنێت زانینمان لە بارەی ئەو ئاژەڵەشەوە لەناودەچێت، بەڵام گەلێک شتی دیکەی زانراو هەن، کە ئێمە زانینمان لە بارەیەوە هەیە.

هەستکردنیش بە هەمان شێوەیە؛ ئەوەی هەستپێکراوە پێش هەستکردن دەکەوێت. لەگەڵ لەناوچوونی هەستپێکراو هەستکردنەکەش نامێنێت. بەڵام لەناوچوونی هەستکردن هەستپێکراو نافەوتێنێت. هەستکردن لەگەڵ لەشدایە، ئەگەر لەشەکە تێکبشکێت ئەوا هەستپێکراوەکەش لەناودەچێت. لەم لایەنەوە لەگەڵ لەناوچوونی هەستپێکراوەکە هەستکردنیش لەناو دەچێت. هەستکردن هەستپێکراو لەگەڵ خۆیدا پەلکێش ناکات. ئەگەر ئاژەڵێک بمرێت هەستکردنیشی نامێنێت، بەڵام هێشتا شتێک دەمێنێتەوە، کە بە هەستپێکراو دادەنرێت. هەستکردن لەگەڵ ئەو شتەدا دێتەکایەوە، کە تەوانای هەستکردنی هەیە. ئاژەڵ و هەستکردن پێکەوە لە یەک کاتدا سەرهەڵدەدەن. بەڵام هەستپێکراو پێش بوونی ئەمان دەکەوێت. ئاگر و ئاو و توخمەکانی دیکە، کە ئاژەڵیشیان لێپێکدێت پێش بوونی ئاژەڵ یان هەستکردنی ئاژەڵەکە دەکەون. کەوابوو، هەستپێکراو پێش بوونی هەستکردن دەکەوێت.

لێرەدا (بۆ هەندێک کەس) لەگەڵ نکۆڵی کردن لەوەی جەوهەر یان جەوهەری دووەم پەیوەندیدار نەبێت، کێشە دروست دەبێت. ڕاستە، کە جەوهەری یەکەم پەیوەندیدار نیە؛ بەشێکی یان هەمووی بە پەیوەندیدار دانانرێت. مرۆڤێکی تاکە کەس بە تاکە کەسی مرۆڤێک دانانرێت یان ناتوانین بڵێین گایەک تاکە ئاژەڵی گایەکە.

بەشەکانی جەوهەری یەکەمیش هەمان تەفسیریان بۆ دەکرێت؛ دەستی تاکە کەسێک بە دەستی تاکە کەس دانانرێت، بەڵکو دەستی کەسێکە؛ سەری تاکە کەسێک سەری تاکە کەس نیە، بەڵکو سەری کەسێکە. جەوهەری دووەمیش بەم شێوەیە یە. مرۆڤ بە مرۆڤیی کەسێک، گا بە گایی ئاژەڵێک یان بارەدار بە بارەداری کەسێک ناوزەد ناکرێت. لەم حاڵەتانەدا دەردەکەوێت، کە[جەوهەری یەکەم و دووەم] پەیوەندیدار نین. بەڵام لە هەندێک حاڵەتدا و بۆ هەندێک لە جەوهەری دووەم بوونی پەیوەندی مشتومڕی لەسەر دەکرێت. بۆ نموونە، لەوێدا، کە دەوترێت سەر سەری کەسێکە یان دەست دەستی کەسێکە جۆرە پەیوەندییەک دەستنیشان دەکرێت.

ئێستا، ئەگەر پێناسەکەمان بۆ پەیوەندی دروست بێت، ئەوا ئێمە بەسەر گرفتەکەماندا تێدەپەڕین یان مەحاڵە جەوهەر خاوەنی پەیوەندی بێت. ئەگەر دروست نەبێت و پەیوەندی لەگەڵ ئەو بوونانەدا بێت بەرانبەرەکەیان دەدۆزرێتەوە ئەوە تاکو ڕادەیەک وەڵامی پرسیارەکەمان مسۆگەر کردووە. پێناسەکەی سەرەوە بۆ هەموو شتە پەیوەندیدارەکان دەگونجێت، بەڵام هێشتا بوونیان ئەوە نیە، کە پەیوەندییەکە دەریدەخات.

ئاشکرایە، ئەو کەسەی بە تەواوی پەیوەندییەک بناسێت، دەزانێت ئەو پەیوەندییە لەنێوان چییدا دانراوە. ئەوەی بزانێت (ئەو) ە چییە، کە پەیوەندیدارە و بوونی پەیوەندیداریش وەکو بوونی ئەو شتانەیە پەیوەندییان پێکەوە هەیە، دەزانێت ئەو پەیوەندییە لەنێوان چییدا دانراوە. ئەگەر نەزانێت لەنێوان چییدا پەیوەندییەکە دانراوە ناتوانێت بە تەواوی پەیوەندییەکەش بناسێت. لە حاڵەتی

هەبووە هەندەکییەکانیشدا ئەمە ئاشکرایە. ئەگەر کەسێک بە تەواوی بزانێت (ئەو) شتە دووقاتە، هاوکات، بە تەواوی دەزانێت دووقات پەیوەندی لەگەڵ چی دیکەدا هەیە و بە پێچەوانەشەوە دروستە.

بە هەمان شێوە، ئەگەر کەسێک بە تەواوی بزانێت (ئەو) شتە جوانە، پێویستە بە تەواوی بزانێت، کە لە شتێکی دیکە جوانترە. ئەگەر بە تەواوی ئەو جوانییە نەناسێت ناتوانێت لەگەڵ شتێکی کەمتر جوان بەراوردی بکات و پەیوەندییەکە دیاری بکات. کەوابوو ئاشکرایە هەر کەسێک بە تەواوی شتێکی پەیوەندیدار بناسێت دەزانێت ئەو شتە لەگەڵ چییدا پەیوەندی هەیە. بەڵام لە حاڵەتی سەر و دەست و ئەم جۆرە جەوهەرانە، دەگونجێت بە تەواوی بیانناسین، بە بێ ئەوەی پەیوەندییەکەیان لەگەڵ شتێکی دیکەدا بدۆزینەوە. پێویست ناکات بزانین ئەوە سەر یان دەستی کێیە. ئەمانە پەیوەندیدار نین. ئەگەر پەیوەندیداریش نەبن ئەوا دروستە بڵێین، هیچ جەوهەرێک پەیوەندیدار نیە.

٨. مەبەستم لە (چۆنیەتی) ئەوەیە، کە دەخرێتە سەر شتێک و شتەکە بە ڕێگەی ئەو چۆنیەتەوە باسدەکرێت. بەڵام چۆنیەتی یەکێکە لەو لایەنانەی باسدەکرێن. یەکێک لە چۆنیەتیەکان حاڵەت و ئەوی دیکە هەل و مەرجە. ئەم دوو جۆرە چۆنیەتیە جیاوازن چونکە حاڵەت لە هەل و مەرج زۆرتر دەمێنێتەوە و زۆرتریش نەگۆڕە. بۆ نموونە بەشەکانی زانین و چاکەکان. زانین وادەردەکەوێت هەمیشەیی بێت و گۆڕان تیایدا دژوار بێت. کەسێک زانیارییەکی کەمیشی لە یەکێک لە بەشەکانی زانیندا هەبێت توشی ئەم حاڵەتە نەگۆڕە دەبێت. مەگەر نەخۆش یان ڕوودانێک گۆڕانی بە سەردا بهێنێت. چاکەش

بەم شێوەیە هەمیشەیی و نەگۆڕە؛ دادپەروەری، مامناوەندێتی و جۆرەکانی دیکەی چاکەش ئاسان نیە گۆڕان تیایاندا ڕووبدات.

ئەوەی زوو گۆڕانی بەسەردا دێت هەل و مەرجەکانە، بۆ نموونە گەرما، سەرما و نەخۆشی و تەندروستی و زۆری تریش هەل ومەرجن. مرۆڤ لە ڕێگەی ئەمانەوە هەل و مەرجی توش دەبێت و خێراش لە گەرماوە بۆ سەرما یان لە لەش ساخییەوە توشی نەخۆشی دەبێت. لەم ڕووەوە هەندێک لایەنی مرۆڤ هەن، کە گۆڕانکاری تیایاندا دژوارە و بە حاڵەت دادەنرێن. حاڵەت بەوە دەوترێت درێژ خایەنە و گۆڕانیش بە ئاسانی تیایدا ڕوونادات. ئەوانەی ناتوانن لە بەشێکی زانیندا شارەزایەکی تەواوبن و بە ئاسانی بگۆڕێن، لەنێو حاڵەتی زانیندا دانانرێن هەر چەندە لە چەند هەل و مەرجێکدا لەو زانینەدا باش یان خراپ بن. لەم ڕووەوە حاڵەت و هەل و مەرج جیاوازن. یەکەمیان گۆڕانی تیادا بە ئاسانی ڕوونادات و دووەمیان بە ئاسانی دەگۆڕێت.
حاڵەتەکان هەل و مەرجن، بەڵام هەل و مەرجەکان حاڵەتەکان نین. ئەو کەسانەی لەنێو حاڵەتێکدان هەل و مەرجیشیان تێدایە. بەڵام ئەوانەی هەل و مەرجیان تێدایە هەموو کاتێک لەنێو حاڵەتدا نین.

جۆرێکی دیکەی چۆنیەتی ئەوەیە، کە ئێمە لە ڕێگەیەوە کەسێک بە یاری زانی مشت لێدان، ڕاکەر، لەش ساخ یان نەخۆش دادەنێین. بە کورتیەکەی ئەم چۆنیەتییە تەوانایی یان ناتەواناییەکی سروشتییە لەو کەسەدا. بۆ نموونە، بە کەسێک دەڵێین یاری زانی مشت لێدان یان ڕاکەر نەک لەبەر ئەوەی کەسەکە لەو حاڵەتەدایە، بەڵکو بە سروشت تەوانای ئەو یارییەی هەیە. کەسێک لەش ساخە چونکە

بە سروشت لەشی بەرگری لە نەخۆشی دەکات و نەخۆشیش ئەو کەسەیە، کە بە سروشت لەشی ناتوانێت بەرگری بکات. بە هەمان شێوەش بۆ ئەو شتانەی ڕەق یان نەرمن: ڕەق ئەو شتەیە، کە تەوانای ئەوەی تێدایە بە ئاسانی پارچە پارچە نەکرێت. نەرمیش لەو تەوانایییە بێبەشە. جۆری سێیەمی چۆنیەتی، چۆنیەتی کارتێکەر و کارتێکردنە. نموونەی ئەمانەش شیرینی، تاڵی، ترشی و لەم جۆرانەیە. هەروەها گەرمی، ساردی، ڕەنگ زەردی و ڕەش داگەڕانیش دەگرنەوە. هەنگوین شیرینە چونکە شیرینی تێدایە، تەنێک ڕەنگ زەردە چونکە زەردایی تێدایە. ئەمانە بە چۆنیەتی کارتێکەر دادەنرێن، نەک لەبەر ئەوەی کاریان تێکراوە. گەرما و سەرما پێیان ناوترێت چۆنیەتی کارتێکەر چونکە ئەوەی ئەم خەسڵەتانەیان هەڵگرتوە کاریان تێکراوە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە، کە ئەم چۆنیەتییانە کاردەکەنە سەر هەستەکان. شیرینی جۆریک لە کارتێکردن بەسەر هەستی تامکردن و گەرما بەسەر هەستی دەست لیدانەوە جیدەهێڵێت.

ڕەنگ زەردی و ڕەش داگەڕان و ڕەنگەکانی دیکە، وەکو شیرینی و تاڵی و گەرمی و ساردی چۆنیەتی کارتێکەر نین چونکە ئەمانە لە ئاکامی کارتێکردنەوە سەریان هەڵداوە. گۆڕان لە ڕەنگەکاندا لە ڕێگەی کارتێکردنەوە ئاشکرایە؛ کەسێکی شەرمن ڕەنگی سور هەڵدەگەڕێ و ترسنۆکیش ڕەنگی زەرد دەبێت. کەسێک لە ژێر ئەم کارتێکردنانەدا بێت ڕەنگیشی دەگۆڕێت. ئەو حاڵەتەی لەشی ئەو کەسەی تێدایە لە شەرم کردنەکەدا، کە دەبێتە هۆی گۆڕانی ڕەنگی سروشتییە و گۆڕانەکەشی سروشتییە. ئەگەر ئەم هەل و مەرجانە لەنێو کارتێکردنەوە سەریان هەڵدابێت و گۆڕانیان دژواربێت

و هەمیشەیی بن، بەچۆنیەتی ناوزەد دەکرێن. ئەگەر بێ ڕەنگی و ڕەش داگەڕان لە سروستی [ئەو کەسەدابێت] دەبن بە چۆنیەتی؛ ئەگەر لە ئاکامی نەخۆشییەکی درێژخایەنەوە پەیدابووبن یان ئەو کەسە هەتاو سوتانبێتی و بە ئاسانی نەڕۆن و بەدرێژایی تەمەن لەگەڵ ئەو کەسەدا بن، بە چۆنیەتی دادەنرێن. هەر شتێک بە ئاسانی و زوو لەناوبچێت بە کارتێکردنی دادەنێین و هیچ کەسێک لە ڕێگەی ئەوەوە ناناسرێت. ئەو کەسەی لە شەرما سور هەڵدەگەرێ پێی ناوترێت سورە یان بە ڕەنگ زەردە نالێین زەردە، بەڵکو دەڵێین، ئەو کەسە کاری تێکراوە. لەبەر ئەمە ئەوانەی کارتێکراون چۆنیەتی نین.

بەهەمان شێوە، کە لەسەر دەروون دەدوێین باسی چۆنیەتی کارتێکەر و کارتێکردن دەکەین. هەموو ئەو [خەسڵەتانەی] لە منداڵییەوە لەگەڵ ئەو کەسەدان بە چۆنیەتی دادەنرێن، بۆ نموونە، شێتی و توڕەبوون، کە لە مرۆڤێکدا بەدیاردەکەون، ئێمەش لە باسەکەماندا بەو مرۆڤە دەڵێین توڕەیە یان شێتە. هەمان شێوەش، ئەو جۆر ەشێواندنانەی، نەک بە سروشت هەن بەڵکو لە هەل و مەرجێکدا سەرهەڵدەدەن و گۆڕانیان دژوارە یان هەر بە تەواوی ناتوانین بیان گۆڕین، چۆنیەتین. ئەوانەی زوو لە ئاکامی ڕووداوێکەوە پەیدادەبن و لەناودەچن، کارتێکراون. بۆ نموونە لێقەوماوێک توڕە دەبێت، چونکە ئەوەی لەژێر ئەم کارتێکردنەدا بێت توڕەیە. دەڵێین ئەو مرۆڤە لەژێر باری کارتێکردندایە. ئەمە کارتێکراوە نەک چۆنیەتی.

جۆری چوارەمی چۆنیەتی (شێوە) یە، بە تایبەتی شێوەی دەرەکی شتەکان، وەکو ڕێکی و خواری و زۆری دیکەش. لە ڕێگەی ئەمانەوە

دەتوانین باسی شتەکان بکەین؛ دەڵێین ئەو شتە سێ گۆشە یان چوارگۆشەیە یان خوارە. لەوانەیە چەمکەکانی، وەکو دەگمەن، پڕ، زبر یان لوس ئاماژە بۆ چۆنیەتی بکەن؛ لەوانەشە سەر بە چۆنیەتی نەبن. وادەردەکەوێت دۆخ بن و چەند بەشێکی ئەو شتە دەردەخەن. شتێک پڕە چونکە هەموو بەشەکانی لەیەکدییەوە نزیکن و پێکەوەن. ئەوەی دەگمەنیشە بەشەکانی لە یەکدی دابڕاون. لوس ئەو شتەیە، کە بەشەکانی لەسەر هێڵی ڕاست ڕیزکراون و زبریش بەوە دەوترێت، کە هەندێک لە بەشەکانی لەسەرو بەشەکانی دیکەوە ڕاوەستاون. لەوانەیە جۆری دیکەی چۆنیەتی هەبێت، بەڵام ئێمە لێرەدا باسی هەموو ئەو جۆرانەمان کردوە، کە دەیانناسین. کەوابوو، ئەوانەی باسمانکردن چۆنیەتین، هەروەها ئەو شتانەی لە یەک سەرچاوەوە دەرچوون و بە هاوسەرچاوە دادەنرێن، چۆنیەتین. بە دڵنیاییەوە لە هەموو کاتێکدا، بە تایبەتی لەم نموونانەدا، وەکو مرۆڤی ڕەنگ زەرد و ڕێزماننناس و دادپەروەر لە ڕەنگی زەرد و ڕێزمان و دادەوە پەیدابوون. بەڵام لە هەندێک حاڵەتدا لەبەر ئەوەی ناوێکمان بۆ چۆنیەتییەکە نیە، مەحاڵە ئەو شتانە بە هاوسەرچاوە دابنێین. بۆ نموونە ، یاری زانی مشت لێدان و ڕاکەرەکە لەم جۆرەن. ئەوان بە هۆی ئەو تەوانایییەوە، کە تیایاندایە ناویان لێنراوە و ئەو چۆنیەتییەیان بۆ دانراوە. هەندێک جار، ئەگەر چۆنیەتییەک ناوێکی دیاریکراویشی هەبێت و ئەوشتەی، کە ئەو چۆنیەتییەی هەیە پێ بناسرێت، هێشتا بە هاوسەرچاوە ناوزەد ناکرێت. بە مرۆڤێک دەوترێت چاک کە چاکەی هەیە یان ئەوەی هەیەتی چاکەیە؛ بەڵام ناوی ئەو مرۆڤە لەگەڵ چاکەکەدا یەک سەرچاوەیان نیە. بە هەر حاڵ ئەم جۆرە چۆنیەتییە زۆر کەم پەیدادەبێت. کەوابوو، هەموو ئەو شتانەی باسمان کردن و هاوسەرچاوەن بە چۆنیەتی دادەنرێن.

چۆنیەتی لایەنی دژوەستاوی هەیە. بۆ نموونە لایەنی دژوەستاوی دادپەروەری نادادپەروەرییە، سپی ڕەشە و هتد؛ هەروەها ئەم لایەنە دژوەستاوانە دەبن بە چۆنیەتی بۆ ئەو شتانەی دەخرێنە سەریان. بەڵام ئەمە لە هەموو حاڵەتێکدا ڕوونادات؛ هەرچەندە ڕەنگی سور یان زەرد چۆنیەتین هێشتا لایەنی دژوەستاویان نیە.

لەسەرو ئەمەوە، ئەگەر یەکێک لە لایەنە دژوەستاوەکە چۆنیەتی بێت، ئەوا هەردوو لایەنەکە دەبن بە چۆنیەتی. ئەمەش بە ورد بوونەوەمان لە بارەکەی دیکە دەردەکەوێت. ئەگەر دادپەروەری چۆنیەتی بێت و دژوەستاوەکەشی نادادپەروەری بێت، ئەوا نادادپەروەریش چۆنیەتییە چونکە هیچ لە بارەکانی دیکەی، وەکو چەندەکی و پەیوەندی لەگەڵ نادادپەروەرییدا ڕیک ناکەون.

چۆنیەتی کەم و زۆر دەبێت؛ شتێک ڕەنگی زەردی زۆرتر لە شتێکی دیکە هەڵگرتوە، کەسێک لەوی دیکە دادپەروەرترە. هەروەها چۆنیەتی لەنێو خۆیدا ئەم گۆڕانەی بەسەردا دێت. شتە ڕەنگ زەردەکە زەردتر دەبێت. ئەمەش لە هەموو حاڵەتێکدا ڕوونادات، بەڵام لە زۆرینەیاندا بەم شیوەیەیە. لەوانەیە ئەو پرسیارە بکرێت، کە دەتوانین بڵێین کەسێک لەوی دیکە دادپەروەری زۆرترە. هەندێک مشتومڕیان لەسەر ئەم کێشەیەکردوە. لەو باوەڕەدان دادپەروەرێک لەوی دیکە دادپەروەرتر نیە یان کەسێکی لەش ساخ لەوی دیکە لەش ساختر نیە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان نکۆڵی لەوە ناکەن، کە کەسێک تەندروستی لەوی دیکە باشترە و هتد. بە تێکڕا،[ئێمە لەو باوەڕەداین] ئەم چۆنیەتیانە کەم و زۆردەبن. کەسێک لەوی دیکە ڕیزماننناسێکی چاکتر و لەش ساختر و دادپەروەرترە.

ئەم گۆڕانە لە سێ گۆشە و چوارگۆشەدا ڕوونادات. ئەو شتانەی بە سێ گۆشە و چوارگۆشە دادەنرێن و پێناس دەکرین، سێ گۆشە و چوارگۆشەن. ناتوانین بڵێین چوارگۆشەیەک زۆرتر لە لاکێشەیەک بازنەیی یە چونکە هەر یەکێک لەمانە پیناسەی جیاوازی بۆ دەکرێت. بە کورتیەکەی، دوو شت یەک پێناسەیان بۆ نەکرێت، ناتوانین بڵێین کەمتر و زۆرترن لە یەکدییەوە. کەوابوو، هەموو چۆنیەتییەک کەم و زۆر نابێت.

ئەوانەی باسمانکردن تایبەتمەندێتی چۆنیەتی نین، بەڵام لە ڕێگەی چۆنیەتیەوە دەڵێین ئەو شتانە لە یەکدی دەچن یان لە یەکدی ناچن؛ ئەوەی دوو شت لە یەکدی جیادەکاتەوە چۆنیەتییە. کەوابوو، لەسەر تایبەتمەندێتی چۆنیەتی لێکچون و لێکنەچوون بۆ شتەکان دادەنرێن. لەوانەیە لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا بشێوێن، کە گوایە ئەوەی ئێمە بە چۆنیەتی دادەنێین لە پەیوەندییدا هەیە (چونکە حاڵەت و هەل و مەرجەکان بەشێکن لە پەیوەندی). هەروەها لە هەموو حاڵەتە گشتییەکاندا باسی پەیوەندییەکمان لەگەڵ شتێکدا کردووە، بەڵام هیچ حاڵەتێکی هەندەکی بەم شیوەیە نابینرێت. زانین زانینی شتێکە؛ بەڵام حاڵەتە هەندەکییەکان جیاوازن و ئەو شتە نین، کە دەبن بە خەسڵەت لەنێو شتێکی دیکەدا. بۆ نموونە ڕێزمان بۆ شتێکی دیکە دانانرێت هەروەها بە مۆسیقا ناڵێین مۆسیقای ئەو شتە. تەنیا، وەکو جۆرێکی گەورە ئەمانە دەخرینە سەر شتێکی دیکە؛ ڕێزمان دەبێت بە زانین سەبارەت شتێک (نەک ڕێزمانی شتێک) و مۆسیقاش زانینی شتێک (نەک مۆسیقای شتێک). کەوابوو، حاڵەتی هەندەکی لەم نموونانەدا پەیوەندی نین بەڵکو چۆنیەتین چونکە ئەم چۆنیەتییانە هەڵدەگرین (لەبەر ئەوەی جۆرە

زانینێکمان هەیە بۆیە بە زانا دادەنرێین). هەمان کات، دەگونجێت شتێک لەیەک کاتدا چۆنیەتی و پەیوەندیش بێت.

٩. کردەوە و کارتێکراو دژوەستاویان هەیە، کەم و زۆریش دەبن. گەرما دژوەستاوی سەرمایە، هەروەها گەرما بوونیش دژوەستاوی ساردبوونە و ئازارچێشتنیش دژوەستاوی خۆشی بوونە؛ ئەمانە دژوەستاون. هەروەها کەم و زۆریش دەبن. گەرما کەم و زۆردەبێت، هەروەها دەتوانین شتێک زۆرتر یان کەمتر گەرم بکەین. ئازار و خۆشی زۆرتر یان کەمترمان هەبێت. کەوابوو، کردەوە و کارتێکراو کەم و زۆر دەکرێن.
[ئێمە باسی ئەمانەمان کرد، هەروەها باسی ئەو بوونەشمان کرد، کە لەنێو دۆخێکدایە و لەگەڵ پەیوەندییا دامانا و گوتمان، کە هاوسەرچاوەیە. لە بارەی شتەکانی دیکەوە، وەکو کویێ، کەی، هەیەتی، بێجگە لەوەی لە سەرەتاوە ئاماژەمان بۆ کردن باسمان نەکردوون. مەبەست لە هەیەتی ئەوەیە، کە (کەسێک پێڵاوێکی لە پێدا بێت)، (چەکی بە شانەوە بێت) کویێ، (بۆ نموونە دەڵێین لە لۆکێومە) و هتد.]

١٠. [سەبارەت بە ئەم چەمکە گشتییانە زۆرمان گوت. پێویستە باسی دژەکان و ئەو شێوازە جیاوازانە بکەین، کە شتەکان تیایاندا دژانە ڕادەوەستن.]
بە چوار شێوە شتەکان دژی یەکدی ڕادەوەستن: لە پەیوەندییدا، وەکو پێچەوانە، لە بێبەرییبوون و خاوەنێتییدا، دواجاریش لە سەلماندن و ڕەتدانەوەدا. بۆ نموونە: لە پەیوەندییدا دژایەتی لە نێوان نیوە و دووقاتدا دەردەکەوێت؛ لەگەڵ پێچەوانەدا لە نێوان

چاکە و خراپەدا؛ لەگەڵ بێبەریبوون و خاوەنێتییدا لە نێوان کوێر و چاوساخدا، لەگەڵ سەلماندن و ڕەتدانەوەشدا، لەنێوان (ئەو کەسە دانیشتوە.) و (ئەو کەسە دانەنیشتوە.) دەردەکەوێت.

ئەو شتانەی لە پەیوەندییاندا دژوەستاون، وەکو خۆیان بە ناوی خۆیانەوە ناودەبرێن، هەندێک جاریش لە پەیوەندییان لەگەڵ یەکدا. بۆ نموونە، بە دووقات دەوترێت دووقاتی نیوە. هەروەها زانین و زانراویش لە پەیوەندییاندا دژانە ڕادەوەستن. زانراو بەوە دەوترێت زانین لە بارەیەوە هەیە. لەم ڕووەوە دژوەستاوەکانی نێو پەیوەندی بە ناوی خۆیانەوە بانگ دەکرێن.

دژوەستاوەکانی نێوان ئە ولایەنانەی پێچەوانەن ناوی خۆیانی لێنانرێت. چاکە بە چاکەی خراپ دانانرێت، بەڵکو شتێکە بە پێچەوانەی خراپەوە. هەروەها سپی سپیایی ڕەنگی ڕەش نیە و پێچەوانەیەتی. لەم ڕووەوە لایەنە دژەکان لە یەکدییەوە جیاوازن.

ئەگەر لایەنە پێچەوانەکان بەو جۆرەبن، کە هەریەکێکیان بە تەنیا و سەربەخۆ ببێت بە بار، هیچ شتێک ناکەوێتە نێوانیانەوە. نەخۆشی و لەش ساخی لە لەشێکدا تەنیا و سەربەخۆ ڕوودەدەن. پێویستە هەر یەکێک لەم دووانە لە نێوان لەشێکدا پەیدابن. هەروەها جووت و تاک بۆ ژمارە دادەنێین؛ هەر یەکێک لەمانە بە تەنیا دەبێت بە خەسڵەتی ژمارە. هیچ شتێک ناکەوێتە نێوان نەخۆشی و لەش ساخی و جووت و تاکەوە. ئەگەر هەر یەکێک لەم دوو لایەنە نەتوانێت بە تەنیا هەبێت ئەوا شتێک لە نێوانیاندا سەرهەڵدەدات. بۆ نموونە ڕەش و سپی لە شتێکدا هەن، بەڵام پیویست ناکات هەر

یەکێک لەو ڕەنگانە لەو شتەدا هەبێت چونکە هەموو شتێک ڕەش و سپی نیە. هەروەها چاکە و خراپە دەخرێنە پاڵ زۆرکەس و زۆرشت. بەڵام پێویست ناکات ئەمانە لەگەڵ ئەو شتەدابن (هەموو کەسێک چاک یان خراپ نیە). لە نێوان ئەمانەدا شتێکی دیکەش هەیە؛ ڕەنگی خۆڵەمێشی زەرد و ئەوانی دیکە کە لەنێوان ڕەش و سپیدان. بەڵام لەنێوان چاکە و خراپەدا نەچاکە نەخراپە هەیە. لە هەندێک حاڵەتدا دەتوانین ناو لەو شتە بنێین، کە دەکەوێتە نێوانیانەوە. بۆ نموونە ڕەنگی خۆڵەمێشی لە نێوان ڕەش و سپیدایە. لە هەندێک حاڵەتی تردا ناونانەکە ئاسان نیە. لەگەڵ ڕەتدانەوەی هەر یەکێک لە لایەنەکانیش ناوەندەکە دەردەکەوێت. بۆ نموونە دەڵێین نەچاکە و نەخراپ، نەدادپەروەرە و نەنادادپەروەر.

بێبەریکردن و خاوەنێتی بۆ یەک شت دادەنرێن. کوێری و چاوساخی بۆ چاو دادەنرێن. هەر یەکێک لەوانە بەستراون بەو شتەوە، کە خاوەنیەتی. هەر شتێک بتوانێت ببێت بە خاوەنی شتێکی دیکە لەو شتەش بێبەری دەبێت، کە ئەو شتەی بە سروشت نەبێت. کەسێک دانی لە دەمدا نەبێت بە بێ دان و ئەوەی نابینابێت بە کوێر دانانێین، بەڵکو لەوێدا ئەو کەسە بێ دانە یان کوێرە کە بە سروشت دەبێت ئەو شتانەی هەبێت، بەڵام نیەتی. هەندێک بە کوێری و بێ دان لە دایک دەبن یان پەیدا دەبن هێشتا بە کوێر و بێ دان ناوزەد ناکرێن.

بێبەریکردن و خاوەنێتی، بێبەری بوون و موڵکداری نین. چاوساخی خاوەنێتی و کوێری بێبەریکردنە، بەڵام بینایی هەبوون، بینایی نیە و کوێربوونیش کوێری نیە. کوێری جۆرێکە لە بێبەریکردنێکی

دیاریکراو. کوێربوونیش بێبەشییە نەک بێبەریکردن. ئەگەر کوێربوون و کوێرێتی یەک شت بوونایە هەردووکیان دەبوون بە بار بۆ هەمان شت. بەڵام ئەو مرۆڤەی کوێرە پێی ناوتری کوێری. بێبەریکردن و خاوەنێتی وەکو دژوەستاو دەردەکەون. کوێری و چاوساخی دژوەستاون. بە هەمان شیوە، کوێربوون و چاوساخ بوونیش دەبن بە دژوەستاوی یەکدی.

هەموو ئەو شتانەی سەلماندن و ڕەتدانەوەیان بۆ دادەنێین سەلماندن و ڕەتدانەوە نین. سەلماندن دەستەواژەیەکی سەلمێنراوە و ڕەتدانەوەش دەستەواژەیەکی ڕەتدراوە. بەڵام ئەوانەی لێرەدا سەلمێنراون یان ڕەتیان دراوەتەوە دەستەواژەکە نیە. لە کاتێکدا دوو دەستەواژەی، وەکو (ئەو دانیشتوە.) و (ئەو دانەنیشتوە.) بە دژوەستاو دادەنێین، ئەو ڕاستەقینانەی لەم دەستەواژانەدا ئاماژەیان بۆ کراوە دژوەستا و ڕادەوەستن.

ئاشکرایە، بێبەریکردن و خاوەنێتی وەکو لایەنە پەیوەندیدارەکان دژانە ڕاناوەستن. دادپەروەری نابێت بە دادپەروەری لایەنە دژەکەی و بینایش چاوی ساخی کوێری نیە. بە هەمان شێوە، کەس بە کوێری ناڵێت کوێری چاوساخی. کوێری بێبەریکردنە لە چاوساخی و بە کوێری چاوساخی دانانرێت. بە پێچەوانەی ئەمەوە، هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان پەیوەندییان لەگەڵ یەکدییدا هەیە. لەم ڕووەوە ئەگەر کوێری پەیوەندی بووایە، دەبوایە پەیوەندی بە شتێکی دیکەوە هەبوایە، بەڵام نیەتی چونکە بە بینایی ناوترێت بینایی کوێرێتی.

لەم حاڵەتانەدا باسیان دەکەین، ئاشکرا دەردەکەوێت، کە بێبەریکردن و خاوەنێتی بە پێچەوانەوە نین. لەگەڵ ئەوانەی بە پێچەوانەن و هیچ ناوەندێکیان نیە پێویستە یەکێک لە لایەنەکان بە سروشت لەو شتەدا بێت، کە بارهەڵگرێتی. هیچ شتێک لە نێوان ئەوانەدانەبوو، کە دەیانتوانی ئەو [بێبەریکردن و خاوەنێتیانە] وەرگرن، بۆ نموونە لە حاڵەتی نەخۆشی و لەش ساخیدا یان جووت و تاکدا. ئەگەر شتێک بکەوێتە نێوان دوولایەنەکەوە، ئەوا پێویست ناکات یەکێک یان هەردوو لایەنەکە سەر بە شتێک بن. پێویست ناکات هەموو شتێک ڕەش یان سپی بێت، گەرم یان سارد بێت چونکە دەتوانین شتێک لەنێوانیاندا دابنێین. لەسەرو ئەمانەوە شتێک لەنێوان ئەو دوولایەنەدا هەیە، کە یەکێکیان پێویست دەکات و تەواناى وەرگرتنی هەیە، بەڵام ئەمە بۆ ئەوە ناشێت، کە بە سروشت ئەو چۆنیەتییەی هەڵگرتوە، بۆ نموونە گەرمایی بە سروشت لە ئاگردایە یان بەفر بە سروشت سپییە. لەم حاڵەتەدا پێویستە ئەم دوو شتە پێکەوە بن و بە ڕووداو نەخراونەتە سەر یەکدی. مەحالە ئاگر سارد و بەفر ڕەش بێت. لەم ڕووەوە پێویست ناکات یەکێک لە لایەنەکان بخرێتە سەر هەموو ئەو شتانەی تەواناى وەرگرتنی ئەم چۆنیەتییەیان هەیە. دەخرێتە سەر ئەوانەی بە سروشت تیایاندایە. ئەمەش پێویستە و ڕووداو نیە. بەڵام، ئەم جۆرە باسە بۆ بێبەریکردن و خاوەنێتی ناگونجێت. پێویست ناکات بخرێنە سەر ئەو شتانەی تەواناى وەرگرتنیانی هەیە چونکە شتێک بە سروشت تەواناى بینینی نەبێت بە کوێر یان چاوساخ دانانرێت؛ لەبەر ئەمە ئەو دوو لایەنە، لەو شتەدا بە پێچەوانە خۆیان دەرناخەن و هیچیش ناکەوێتە نێوانیانەوە. ئەگەر بینایی لە سروشتی شتێکدا بێت، لەو حاڵەتەدا دەتوانین بڵێین ئەو شتە کوێرە یان چاوساغ. ئەو کاتەش بە ڕووداو

یەکێک لەم دوو لایەنەی بۆ دادەنرێت.

ئەوانەی بە پێچەوانەوەن، گۆڕانیان تێدا ڕوودەدات ئەگەر ئەوەی بە پێچەوانەوەیە، وەکو گەرمایی بۆ ئاگر لە سروشتی ئەو شتەدا نەبێت. ئەو کەسەی لەش ساخە نەخۆش دەکەوێت، پێست سپییەکیش ڕەش دادەگەڕێت، شتێکی گەرمیش سارد دەبێتەوە. هەروەها دەگونجێت کەسێکی چاک خراپ بێت و خراپیش ببێت بە کەسێکی چاک (ئەگەر ژیانی کەسێکی خراپ بەرەو باشی بڕوات و چاکتریش بدوێت پێش دەکەوێت و دەبێت بە کەسێکی چاک. ئەگەر کەمێکیش گۆڕانی بەسەردا بێت هێشتا بەرەو پێشەوە چووە، کە لەوانەیە گۆڕانێکی گەورە لە خۆیدا دروستبکات. ئەوەی گۆڕانێکی بچوکیش لە خۆیدا دروست کات ڕوو لە چاکە دەکات و گۆڕانی زۆرتر دەهێنێتە کایەوە. لەگەڵ ئەم ڕوودانەدا و  بە گوێرەی کات، ئەو کەسە خۆی دەخاتە نێو حاڵەتێکی پێچەوانەوە).

لە لایەکی دیکەوە، لەگەڵ بێبەریکردن و خاوەنێتیشدا مەحاڵە گۆڕان سەرهەڵدات. گۆڕان لە خاوەنێتییەوە بۆ بێبەریکردن ڕوودەدات، بەڵام لە بێبەریکردنەوە بۆ خاوەنێتی مەحاڵە؛ چاوی کوێر چاک نابێتەوە، کەسێکی سەر ڕوتاوە قژی پەیدا نابێتەوە و ئەو کەسەی دانی لە دەمدا نەماوە جارێکی دیکە دانی ناڕوێتەوە.

دژایەتی نێوان سەلماندن و ڕەتدانەوە بەو جۆرە نیە، لە سەرەوە باسمان کرد. تەنیا لەگەڵ ئەمانە دایە، کە یەکێک لە لایەنە دژوەستاوەکان ڕاست و لایەنەکەی دیکە ناڕاستە. ئەمەش لەنێو پێچەوانەکاندا نەبوو، هەروەها بە سەر پەیوەندی و بێبەریکردن

و خاوەنێتیشدا ساخ نابنەوە. نەخۆشی و لەش ساخی دوو لایەنی پێچەوانەن، بەڵام هیچ لایەنێکیان ڕاست یان ناڕاست نیە. دووقات و نیوە، وەکو پەیوەندی دژوەستاون و هیچ لایەنێکیان ڕاست یان ناڕاست نیە. هەر شتێک لە بەشەکان پێکنەهاتبێت، ڕاست و ناڕاست نین؛ ئەوانەی لە سەرەوە باسمان کردن، لە بەشەکان پێکنەهاتون. لەوانەشە ڕووبدات یان دەرکەوێت هەمان شت بە پێچەوانەوە لەگەڵ ئەوشتانەشدا هەبێت، کە لە بەشەکان پێکهاتون. لەو کاتەدا دەڵێین، "سوکرات نەخۆشە". پێچەوانەکەشی "سوکرات نەخۆش نیە". هێشتا مەرج نیە لەگەڵ ئەمانەدا یەکێکیان دروست و ئەوی دیکە نادروست بێت. ئەگەر سوکرات هەبێت ئەوا یەکێک لەو دوو دەستەواژەیە ڕاست و ئەوی دیکە ناڕاست دەردەچێت. لەو حاڵەتەدا سوکرات نەبێت هەردوو دەستەواژەکە ناڕاست دەبن؛ ڕاستیش نیە بڵێین سوکرات نەخۆشە یان لەش ساخە. بۆ بێبەریکردن و خاوەنێتیش لە کاتێکدا "سوکرات" نەبێت، ئەوا ڕاست نین، ئەگەر سوکراتیش هەبێت یەکێک لەو دوو لایەنە هەمیشە ڕاست نیە. "سوکرات کوێرە" دژی "سوکرات چاوساخە" وەکو بێبەریکردن و خاوەنێتی ڕادەوەستێت؛ ئەگەر سوکرات هەبێت پێویست ناکات یەکێکیان ڕاست یان ناڕاست بێت (چونکە ئەو کاتەی بە سروشت، هەردووکیانی هەبێت ناڕاست دەردەچن). ئەگەر سوکرات نەبێت، ئەوا (سوکرات کوێرە) و (سوکرات چاوساخە) هەردووکیان ناڕاستن. بەڵام، لە حاڵەتی سەلماندن و ڕەتدانەوەدا سوکرات هەبێت یان نەبێت هەمیشە یەکێکیان ڕاست و ئەوی دیکەیان ناڕاست دەردەچێت. ئەمەش خەسڵەتێکی تایبەتی سەلماندن و ڕەتدانەوەیە؛ یەکێکیان ڕاست و ئەوی دیکەیان ناڕاستە.

١١. ئەوەی دژی چاکەیە پێویستە خراپە بێت؛ دەتوانین ئەمە بسەلمێنین- بۆ نموونە لەش ساخی و نەخۆشی، دادپەروەری و نادادپەروەری، ئازایەتی و ترسنۆکی و هتد. هەندێک جار ئەوەی پێچەوانەی خراپەیە چاکەیە و هەندێک جاریش خراپەیە. زۆریی پێچەوانەی کەمییە، کە خراپە. مامناوەندێتی، هەمان کات، پێچەوانەی هەردووکیانە. کەچی چاکە. بە هەر حال، ئەم حاڵەتانە کەمن، بەڵام لە زۆربەیاندا ئەوەی پێچەوانەی خراپەیە چاکەیە.

مەرج نیە هەر دوولایەنی پێچەوانەکان لە بووندا هەبن. دەگونجێت بڵێین، هەموو کەسێک لەش ساخە و نەخۆش نیە. ڕەنگی سپیش هەیە ئەگەر هەموو شتێک سسپی بێت، بەڵام ڕەنگی ڕەش نیە. ئەگەر (سوکرات لەش ساخە) دژی (سوکرات نەخۆشە) بێت، ئەوا لە یەک کاتدا هەردووکیان بۆ سوکرات دانانرێن. ناگونجێت هەردووکیان لە یەک کاتدا و لە یەک کەسدا هەبن. ئەگەر سوکرات لەش ساخ بێت نەخۆش نیە.

لایەنە پێچەوانەکان لە نێو یەک شتدا دەبن (لە نێو جۆری بچوک و جۆری گەورەدان). لەش ساخی و نەخۆشی لە نێو لەشی ئاژەڵدایە، بەڵام سپی و ڕەشی لە هەموو تەنێکدا دەدۆزرێنەوە و دادپەروەری و نادادپەروەریش لە دەرووندا هەن. هەموو دژوەستاوەکان لە نێو یەک جۆری گەورە یان پێچەوانە گشتییەکاندان. ڕەشی و سپی لە نێو یەک جۆری گەورەدا هەن (چونکە ڕەنگ بە گشتی جۆری گەورەی هەردووکیانە)، بەڵام دادپەروەری و نادادپەروری دەکەونە نێو دوو جۆری پێچەوانەوە (جۆری گەورەی یەکێکیان چاکەیە و ئەوی دیکەیان خراپەیە). چاکە و خراپە لە نێو یەک جۆردا نین،

بەڵام هەردووکییان [بۆ بەهای دیکە] دەبن بە جۆر.
١٢. بە چوار شێوە بە شتێک دەوترێت لەپێشتر.
یەکەم، لە نێو کاتدا؛ بە شتێک دەوترێت لەوی دیکە کۆنترە .
دووەم، لە ڕووی پەیوەندییان بە یەکدییەوە لە بووندا، بۆ نموونە ژمارە یەک پێش ژمارە دوو دەکەوێت چونکە بوونی ژمارە دوو پێویستی بە ژمارە یەکە.
سێیەم؛ لە ڕووی ڕیزبوونەوە، وەکو لە زانستەکان و گوتندا. لە نێو زانستە ئەزموونگەرییەکاندا لەپێشتر و پاشتر هەن. توخمەکان لەو شتانەی پێکی دەهێنن لەپێشترن (لە ڕێزماندا توخمەکان لە چاو بڕگەکاندا لەپێشترن)؛ بە هەمان شێوە، لە وتارێکدا پێشەکی لە پێشەوە دادەنرێت.
لەسەرو ئەمانەوە، ئەوەیە، کە بە سروشت لەپێشترە. خەڵکی بۆی دەچن ئەو شتانەی بەهایان هەیە یان خۆشەویستی لەپێشترن. ئەم شێوەیە، کە چوارەمە لە هەموویان کەمتر دەگونجێت.

ئەوانە شێوەکانی لەپێشتر بوون. لەوانەیە لەگەڵ ئەم چوارشێوەیەدا شێوەیەکی دیکەش هەبێت. ئەوەی هۆیە بۆ هۆکردەکەی لەپێشتر دادەنرێت. هەندێک حاڵەت ئەم کێشەیە باشتر دەردەخەن. ئەگەر مرۆڤ هەبێت ئەوا دەستە واژەکەی ئێمە، کە دەڵێین، (مرۆڤ هەیە) لەبەرئەوە ڕاست دەردەچێت چونکە مرۆڤ لەپێشتر[پێش دەستە واژەکەی ئێمە، هەیە] هەمان کات دەستەواژە ڕاستەکە هۆ نیە بۆ بوونی مرۆڤ. وادەردەکەوێت، کە بوونە ڕاستەقینەکە هۆ بێت بۆ ڕاستی دەستەواژەکە. ڕاستی و ناڕاستی دەستەواژە دەکەوێتە سەر بوونی ئەوەی باسدەکرێت. لێرەدا، دەتوانین بڵێین پێنج شێوەی لەپێشتر هەن.

١٣. ئەو شتانەی پێکەوە پەیدادەبن ئەوانەن لە یەک کاتدا دێنە بوونەوە؛ پێش و پاش یەکدی ناکەون. ئەمانە لە نێو کاتدا پێکەوە پەیدا دەبن. بەوانەش دەوترێت، کە بە سروشت پەیوەندییان لەگەڵ یەکدا هەیە و پێکەوەن، بەڵام یەکێکیان بۆ بوونی ئەوی دیکە نابێت بە هۆ. بۆ نموونە دووقات و نیوە. مادامەکی شتێک هەیە دووقاتە، ئەوا ئەو شتە هەمان کات نیوەشی هەیە. ئەگەر نیوەشی هەبێت دووقاتی نیوەکەشی هەیە. بەڵام نیوە و دووقات بۆ بوونی یەک هۆ نین. هەروەها جۆرەکانی نێو جۆرێکی گەورە پێکەوە بە سروشت پەیدادەبن. هاوپلەیی لە نێوان شتەکاندا لە ئاکامی دابەش بوونیان سەرهەڵدەدات؛ بۆ نموونە، ئاژەڵە دڕندەکان و باڵندە و ماسی. ئەمانە سەر بە جۆرێکی گەورەن، کە جۆری ئاژەڵە و ئەو جۆرە دابەش کراوە بۆ ئاژەڵی دڕندە و باڵندە و ماسی. هیچ کامیان پێش یان پاش ئەوی دیکەیان ناکەوێت و بە سروشت لە یەک کاتدا سەریان هەڵداوە (هەر یەکێک لە ئەوانیش بە سەر چەند جۆرێکی دیکەدا دابەش دەبێت). جۆری گەورە هەمیشە پێش جۆری بچوک دەکەوێت. ئەگەر ماسی هەبێت ئەوا پێویستە ئاژەڵ هەبێت، بەڵام مەرج نیە ماسی هەبێت، ئەگەر ئاژەل هەبێت . هەموو ئەو شتانەی لە یەک کاتدا دێنە بوونەوە پێکەوە پەیدا بوون.

١٤. شەش جۆر گۆڕانکاری هەن؛ پەیدابوون، لەناوچوون، زۆربوون، کەم بوون، گۆڕین و جێ گۆڕکێ.[٦] هەر یەکێک لەوانە لە یەکدییەوە جیاوازن (پەیدابوون لەناوچوون نیە، زۆربوون کەم بوون نیە،

٦ - (گۆڕین) چەمکێکە بە واتای گۆڕین لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکە دێت، بۆ نموونە کراسێک گەورەیە بچوکی دەکەینەوە. ئەمە گۆڕینە، بەڵام گۆڕانکاری بە سەر بوونی کراسەکەدا ناهێنێت. (وەرگێڕ)

ئەمانیش جێ گۆڕکی نین). بەڵام پرسیار لە ئاستی گۆڕینەوە سەرهەڵدەدات. ئایا گۆڕین لەوێدا سەرهەڵنادات، کە هەر یەکێک لەم جۆرە گۆڕانکارییانە ڕوودەدات. بە هەرحاڵ، ئەمە دروست نیە. هەموو کارتێکردنێک گۆڕینێکە بە بێ ئەوەی یەکێک لەو گۆڕانکارییانە سەرهەڵدات. مەرج نیە کارتێکردن ببێتە هۆی ڕوودانی کەم کردنیان.

زۆرکردن لە شتێکدا. لەم ڕووەوە گۆڕین لە جۆرەکانی دیکەی گۆڕانکارییەوە جیاوازە. ئەگەر گۆڕین، وەکو ئەوانی دیکە بووایە ئەوەی گۆڕینی تێدا ڕوودەدا، ئەوا کەم و زۆریش دەبوو. هەندێک شت زۆردەکەن بە بێ ئەوەی گۆڕینی بە سەردا بێت. چوارگۆشەیەک بە دانانی لاتەریبێک لەسەر لایەکی گەرەتر دەبێت، بەڵام گۆڕین بەسەریدا نایەت. لێرەدا دەردەکەوێت، کە گۆڕانکارییەکان لە یەکدییەوە جیاوازن.

بە گشتی، گۆڕانکاری پێچەوانەی مانەوەی شتەکانە، وەکو خۆیان. بۆ شتێکی هەندەکی لەناوچوون پێچەوانەی پەیدابوون و زۆربوون پێچەوانەی کەم بوونە. جێ گۆڕکێش لە زۆربەی حاڵەتەکاندا پێچەوانەی وەستانە لە جێگەیەکدا. دەتوانین ڕوو لە جێگەیەک بکەین، وەکو بەرەو ژوور، کە پێچەوانەی بەرەو خوارە. دژوارە پێچەوانەی جۆرەکانی دیکەی گۆڕانکاری لە لیستەکەماندا بدۆزینەوە. گۆڕین گۆڕانکارییە لە چۆنیەتییدا. شتێکیش چۆنیەتییەکەی بگۆڕێت، وەکو خۆی نامێنێتەوە و دەبێت بە چۆنیەتییەکی پێچەوانە ( بوون بە سپی پێچەوانەی بوون بە ڕەشە).

١٥. بە چەند جۆرێک باس لە (هەیەتی) دەکرێت: شتێک حالەت، هەل و مەرج یان چۆنیەتی هەیە (دەڵێین زانین و چاکەمان هەیە)؛ یان شتێک چەندەکی هەیە، وەکو بەرزی (شتێک پینج یان شەش پێ بەرزە)؛ ئەوانەی لەسەر تەنێک یان بە لەشەوە هەن، وەکو قاپوت و چاکەت، مستیلەی پەنجە یان دەست و پا؛ شتێک لەنێو قاپ دادەنیین، گۆزە کە شەرابی تێدایە؛ ئێمە دەڵێین کەسێک خانو یان زەوی هەیە. هەروەها دەڵێین، ئەو پیاوە ژنی هەیە، واتە ئەو پیاوە ژنی هێناوە. لەوانەیە جۆری دیکەی (هەیەتی) هەبێت، بەڵام ئێمە تاکو ڕادەیەک هەموو جۆرەکانمان لێرەدا باس کردووە.

---

تەواو بوو

# ئیندێکس




## Aristotle

# Categories

**Translated from English**

**by**

**Muhammad Kamal**